دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

# ● هونەری رۆژنامەنووسی


● نووسینی: دانا حەبیب کەرکووکی

● وەرگێڕانی: سەمیرە ئەحمەد

● پێداچوونەوە: د. هادی مەحموود

● نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی

● پیتچنین: وەرگێڕ

● بەرگ: ئاسۆ مامزادە

● ژمارەی سپاردن: ١٦١٧

● نرخ: ٢٠٠٠

● چاپی یەکەم ٢٠٠٨

● تیراژ: ١٢٥٠

● چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (٢٨٩)





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com




## پێشکەشە بە ...................

- هۆی بوونم ( دایکم و باوکم )
- هەموو خاوەن قەڵەمێکی بوێر لە بواری رۆژنامەنووسیدا.
- بە مامۆستام لە بواری رۆژنامەنووسیدا (حەبیب کەرکووکی) نووسەر.
- هاوسەرم رۆژنامەنووس شێخ صدیق.
- هەردوو جگەرگۆشەکەم (دامون و دێکۆ).
- بە ر

## پێشەکی وەرگێڕ:

ئەم کتێبەی کە وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی، لە نووسینی مامۆستا حەبیب کەرکوکی-یە، بە ناوی (فنون التحرير الصحفي) کە بە زمانی عەرەبی نووسیوێتی و هەشت هونەرەکەی ڕۆژنامەنووسیی لە خۆگرتووە. لەبەر گرنگی کتێبەکە و کەمبوونی نووسراوی لەم جۆرە بە زمانی کوردی لە بواری هونەری ڕۆژنامەنووسی، بۆیە داوام لە مامۆستا حەبیب کرد کە ڕێگەم پێبدات وەری بگێڕمە سەر زمانی کوردی، ئەویش هاوکاری بەردەوامی کردم هەر لە سەرەتاوە هەتاوەکو تەواوبوونی کتێبەکە، ئەمەش بە هۆکاری ئەوەی لە لایەك قوتابی مامۆستا حەبیبم لە زانکۆی حوڕەی هۆڵەندی، کۆلیژی ڕاگەیاندن، بەشی ڕۆژنامەنووسی و لە لایەکی ترەوە کتێبەکە لە نووسینی خۆیەتی.

هەرچەندە ئاستەنگی زمانەوانی هاتە ڕێم بۆ وەرگێڕانی ئەم بەرهەمە کە ئەویش بە هۆی نەبوونی قوتابخانەیەکی ڕۆژنامەگەری کوردی یەکگرتوو لە ڕووی زاراوەوە، ڕەنگە لە هەندێ شوێندا زاراوەیەکم بەکارهێنابێ، شێوە ئەدەبییەکەی لەگەڵ زمانی ڕۆژنامەنووسیدا نەگونجێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە ئەم کتێبە بە شێوەیەکی ئەکادیمیانە



و ڕوون و ئاسان دارێژراوەو باسی هەر هەشت هونەرەکانی نووسینی ڕۆژنامەنووسیی (هەواڵ، ڕاپۆرت، چاوپێکەوتن، ڕاپرسی، ڕیپۆرتاژ، وتار، سەر وتار، ستوون)ی تێدا کراوە کە وەك پڕۆگرامی خوێندن دانراوەو پەیمانگاو کۆلیژەکان دەتوانن سوودمەند بن لێی.

پاش تەواوبوونی وەرگێڕانەکە بەڕێز دکتۆر هادی مەحمود ئەرکی پێداچوونەوە و بەراوردی دەقە عەرەبییەکە لەگەڵ کوردییەکە، لە ڕووی زمانەوانی و دارڕشتنەوە، گرتە ئەستۆی خۆی و زۆر سوپاسی دەکەم.

هیوادارم توانیبێتم خزمەتێکی بچووك پێشکەش بە کتێبخانە و ڕۆژنامەگەریی کوردی کردبێت و خوێنەران و ڕۆژنامەنووسان سوودی لێوەرگرن.

وەرگێڕ

## هونەری نووسینی ڕۆژنامەنووسی

**پێشەکی:**

مەبەستمان لە هونەری نووسینی ڕۆژنامەنووسی، ئەو نووسینانەیە کە بڵاودەکرێتەوە لە ڕۆژنامە (Newspapers) و گۆڤار (Magazines) و ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکاندا (Electronic Journals) کە ئەمانەن:

١. هەواڵ News
٢. ڕاپۆرت Report
٣. چاوپێکەوتن Interview
٤. ڕاپرسی Survey
٥. ڕیپۆرتاژ Reportage
٦. وتار Essay
٧. سەروتار Editorial
٨. ستوون Column

هونەری ڕۆژنامەنووسی بریتییە لە هونەرێکی داهێنەرانە و هۆیەکە بۆ گەیاندنی زانیاری و بیروڕا و سەرنج بە خوێنەران بە ڕێگەیەکی ڕوون و ئاشکرا، ئەم هونەرانەیش لە ڕووی بابەتەوە جۆراوجۆرن لەوانەیە هەواڵ (ڕامیاری بێت یان ئابووری یان هونەری یان ڕۆشنبیری یاخود کۆمەڵایەتی...هتد، هەروەها ڕاپۆرت و چاوپێکەوتن و ڕاپرسی و ستوونیش بە هەمان شێوە).

ئەم هونەرانە هەریەکەو فەرمانێك جێبەجێ دەکات، بۆ نموونە فەرمانی هەواڵ باسکردنی ڕووداوێکە کە ڕوویداوە یان ڕوودەدات، یان گواستنەوەی لێدوانێکە، بەڵام ڕاپۆرت لە هەواڵ دەچێت تەنها جیاوازییەکەی لەوەدایە کە ڕاپۆرت بە درێژی باسی



ڕووداوەکە و دۆخی دەوروبەری دەکات، یان پێشکەشکردنی زانیارییە لەسەر کەسێك بە مەبەستی ناساندنی بە خوێنەر.

چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسیش ئامانجی دەستکەوتنی زانیاری و بیروڕا و زانیاری کەسێتییە لەسەر ئەو کەسەی کە چاوپێکەوتنی لەگەڵدا ساز دەکرێت بە مەبەستی بڵاوکردنەوەو ناساندن بە خوێنەر.

ڕاپرسی ئامانجی دەرخستنی بیروڕای هاووڵاتیانە سەبارەت بە بابەتێکی پێشنیازکراو بۆ بەردەم کۆمەڵگا و پێویستی بە کۆکردنەوەی بیروڕای جیاواز هەیە، لە ڕاپرسیدا بۆ بابەتێکی گشتی، ڕۆژنامەنووس هەرەمەکی پرسیار لە چەند هاووڵاتییەك دەکات بە بێ دەستنیشانکردنی خەڵکانی تایبەتمەند، بەڵام گەر بابەتەکە تایبەت بە توێژێکی دیاریکراوەوە بوو ئەوا ڕای ئەو توێژە وەردەگیرێ وەك (وەرگرتنی بیروڕای فەرمانبەران سەبارەت بە زیادکردنی مووچە).

ئامانجی ڕیپۆرتاژ دەستکەوتنی بیروڕایە لە بارەی کێشەیەك کە لەناو کۆمەڵ سەریهەڵداوە، ئیدی ئەو کێشەیە ڕامیاری بێت یان کۆمەڵایەتی یان مرۆڤایەتی یان دەروونی یان ئابووریی...هتد، بە ئامانجی دانانی چارەسەری گونجاو بۆی.

مەبەست لە وتاری ڕۆژنامەنووسی خستنە ڕووی زانیاری و بیروڕایە، سەبارەت بە بابەتێکی دیاریکراو، دوای کۆکردنەوەو شیکردنەوەی ئەو زانیارییانە و خستنەڕووی ئاکامەکانی لە لایەن نووسەرەوە، یان دەرخستن و پێشکەشکردنی بیروڕایەکی نوێ لە گۆشەنیگایەکی نوێوە، بە جۆرێك شتێکی نوێ بخاتە بەردەم خوێنەر و هانی بیرکردنەوەی قوڵی لا بدات.

سەروتار ئامانجی ناساندنی سیاسەت و ئاراستەی ڕۆژنامەکەیە بە خوێنەر لە ڕێگەی باسکردن و دەرخستن و شیکردنەوەی بابەتێك یان مەسەلەیەك لە ڕوانگەی ڕۆژنامەکەوە بە باری سەرنج و زانیاری دەخرێتەڕوو، نووسەری سەروتار سیاسەت و ئاقاری ڕۆژنامەکە دەخاتە بەر دیدەی خوێنەران سەبارەت بە بابەتێك یان مەسەلەیەکی نوێ بە مەرجێ نووسەر یەکێك بێت لە کارمەندانی ڕۆژنامەکە، بەڵام

ستوون بریتییە لە باری سەرنجی نووسەرەکە سەبارەت بە مەسەلەیەك جا کۆن بێت یان نوێ بە شێوەیەك کە شیکردنەوە بکات بۆ ئەو مەسەلەیە و گەر زانیاری نوێیش هەبێت کۆی بکاتەوە.

دەتوانین هونەری نووسینی ڕۆژنامەنووسی لەم خاڵانەدا کۆبکەینەوە:

١. هەواڵی ڕۆژنامەنووسی news: باسی ڕووداوێکە کە ڕوویداوە یان ڕوودەدات یان گواستنەوەی لێدوانێك یان وتەیەکە بۆ خوێنەران.

٢. ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی report: درێژەباسێکی ڕووداوێکە کە ڕوویداوە یان ڕوودەدات لەگەڵ شیکاری ژینگەی دەوروبەرەکەی یان گواستنەوەی وتە یا گفتوگۆیەکە لەگەڵ شیکاری تەواو بۆ ئەو بارودۆخەی کە ئەو گفتوگۆیەی تێدا ئەنجامدراوە، یان پێشکەشکردنی زانیاری لەسەر کەسێکی دیاری ناو کۆمەڵگا کە خوێنەر بایەخ دەدات بە هەواڵ و زانیاری لە بارەیەوە.

٣. چاوپێکەوتن interview: ئامانجی دەستکەوتنی زانیاری کەسێتییە لەسەر ئەو کەسەی کە چاوپێکەوتنی لەگەڵدا ساز دەکرێت بۆ بەر دیدەی خوێنەران.

٤. ڕاپرسی survey: خستنە ڕووی باری سەرنجی کۆمەڵێك خەڵکە لە بارەی مەسەلەیەك یان بابەتێکی دیاریکراو بە ئامانجی ناساندنی ڕای گشتی بە خوێنەر.

٥. ڕیپۆرتاژ reportage: ئامانجی خستنەڕووی کێشەیەکە کە ڕووبەڕووی کۆمەڵ بۆتەوە ئیتر ئەو کێشەیە ڕامیاری بێت یان ئابووری یان کۆمەڵایەتی یان مرۆڤایەتی، خستنەڕووی باری سەرنجی ئەو لایەنانەی کە پەیوەندییان بە کێشەکەوە هەیە و پێشنیازکردنی چارەسەری گونجاو بۆی.

٦. وتار essay: خستنەڕووی زانیاری و بیروبۆچوون و بیرکردنەوەو تێڕوانینێکی دیاریکراوە لە بارەی بابەتێك یان مەسەلەیەکی دیاریکراو و گفتوگۆکردن یان شیکردنەوەی ئەم مەسەلەیە و ڕەخنەلێگرتنی.



٧. سەروتار editorial: ئامانجی پێشکەشکردنی تێڕوانینی ڕۆژنامەکەیە لە بارەی بابەتێکی دیاریکراو هەندێ جاریش پشت بە زانیاری و بیروڕا دەبەستێ.

٨. ستوون column: ئامانجی نووسەر لە ستووندا خستنەڕووی زانیاری و باری سەرنجی خۆیەتی لە بارەی کێشەیەك یان بابەتێکی دیاریکراو بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش و خۆشئامێز.

بیرۆکەی دانانی کتێبێك کە هونەری نووسینی ڕۆژنامەنووسی بگرێتەخۆ بە پێویستییەکی کاری ئەکادیمیی دەزانم بە هۆی ئەو بۆشاییەی کە لە کتێبخانەی ڕاگەیاندن و بواری هونەری ڕۆژنامەنووسیدا هەیە. ئەم کتێبە کورتکراوەی ئەو خوێندنەیە کە لە کۆلێژی ڕاگەیاندنی زانکۆی بەغداد لە خوێندنی سەرەتایی بەکالۆریۆس و خوێندنی باڵا (ماجستێر و دکتۆرا) وەدەستم هێناوە، هەروەها تێکەڵاوی کارکردنم لە بواری ڕۆژنامەنووسیدا لەو کاتەی کە دەستم پێکردووە بە پەیامنێری ڕۆژنامەنووسی ساڵی ١٩٩٦ لە شاری بەغداد هەتا ئەمڕۆ، بەبەسەربردنی ئەو نارەحەتیانەی کە تووشم هاتوون لە پێناوی گەیاندنی وشەی ڕاست بۆ خوێنەر، خۆنەویستانە هەوڵمداوە ڕاستییەکان بە خوێنەر بگەیەنم و، سوودیان پێبگەیەنم بۆ ئەوەی ئاشنای جیهانی دەوروبەریان بن، ئەو گەیاندنەش لە ڕێگای چاوپێکەوتن و ڕاپرسی و وتار و ستوون و، لە کرۆکی کاری ڕۆژنامەنووسیمەوە کە بریتی بووە لە گەیاندنی ڕووداوەکان لە ڕێگەی هونەری هەواڵی ڕۆژنامەنووسی و ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی.

**حەبیب کەرکوکی**

## دەسپێك

هەواڵ پێشەنگی هونەری ڕۆژنامەنووسییە: واتە بەبێ هەواڵ کارێکی سانا نییە بۆ ڕۆژنامەنوس شارەزای ژینگەی ڕاگەیاندن بێ، یان چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەنووسی یان ڕیپۆرتاژێك یان ڕاپۆرتێك یان ستوونێك بە ئەنجام بگەیەنێ. واتە هونەرە ڕۆژنامەنووسییەکانی دی زۆر جار بۆ لێکدانەوە و شیکردنەوەی ڕووداوێکن.

بۆیە قوتابخانەکانی ڕۆژنامەگەری گرنگی زۆر بە هەواڵ بە هەموو بابەت و لایەنە جیاوازەکانییەوە دەدەن، هەواڵ بە شادەماری خوێنی ڕۆژنامە دادەنرێت، تا ئەو ڕادەیەی کە هەواڵ بە یەکێ لە توخمە گرنگەکانی ڕۆژنامە دادەنرێت بۆ ڕاکێشانی خوێنەر بۆ خوێندنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤار.

جاروبار کاردەکەن کە هەواڵ ببێ بە گیانی ڕۆژنامە و لەو بارەیەوە وتراوە: (ڕۆژنامە بەرگی ڕاوبۆچوونی داماڵیوەو بەرگی هەواڵی پۆشیوە) ئەمە ڕاستییەکە، هەر لە دەرکەوتنی ئاژانسە هەواڵگرییەکانەوە، ڕۆژنامەکان زیاترین بەشی لاپەڕەکانیان بۆ هەواڵ تەرخانکردووە بە پێی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لەسەر ڕاگەیاندن ئەنجامدراون لە کۆلیژ و پەیمانگەکاندا دەرکەوتووە کە خوێنەران زیاتر بایەخ بە لاپەڕەکانی هەواڵ دەدەن، هەروەها دوای ئەوەی هۆیەکانی ڕاگەیاندن بوون بە پردێك لە نێوان خودی مرۆڤەکان خۆیاندا و ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی لەو گۆشەگیرییەی کە ڕەهەندێکی لە پشتەوە بوو، خوێندنەوەکانیش ئەوە دەسەلمێنن کە خوێنەر چەندە تامەزرۆی هەواڵە بەو ڕادەیەی هەموو لاپەڕەکان دەپشکنێ بۆ خوێندنەوەی هەواڵ، ئەمەش بەڵگەیە بۆ وابەستەبوونی خوێنەر بۆ زانینی ئەو ڕووداوانەی کە ڕۆژانە دەگوزەرێ لە دەوروبەرمان بۆ بەهێزبوونی توانای تێگەیشتنی بۆ ڕووداوەکان و بارودۆخی دەوروبەری، بۆ ئەوەی بەشدار بێت لە دەربڕینی باری سەرنجی و لە بارەی گۆڕانکارییەکانەوە.



ئەمڕۆ هەواڵ بە پیشەسازییەکی ڕاگەیاندن دادەنرێت کە هەموو ڕۆژنامەنووسان بە جیاوازی قوتابخانەکانیانەوە و لە هەر وڵاتێك بن هەوڵی فراوانکردنی دەدەن. زۆربەی پسپۆڕانی بواری ڕاگەیاندن دووپاتی دەکەنەوە کە دروستکردنی هەواڵ سەرەتایەکە یاخود دەروازەیەکە بۆ کاری ڕۆژنامەنووسی، بەبیرۆکەی ئەوان دەربڕینی هەواڵ هەنگاوی یەکەمە لە دەربڕینی هونەرەکانی تری ڕۆژنامەنووسی وەك (ڕاپۆرت- چاوپێکەوتن-ڕاپرسی-ڕیپۆرتاژ -ستوون —وتار و سەروتار)، لەبەر ئەوە هەواڵ بوو بە بایەخدارترین هونەر لە هونەرەکانی ڕۆژنامەنووسیی ئەمڕۆمان، مامۆستایانی ئەمڕۆی بواری ڕۆژنامەنووسی لە وانەی سوورن لەسەر ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە بۆ پێشخستنی هەواڵ کە ببێت بە خواست و داوا لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن و ئاژانسە هەواڵگرییەکاندا.

پەیامنێرەکان لە داڕشتنی هەواڵدا پێشبڕکێ دەکەن بە شێوازێك کە دەربڕینێکی کاریگەریی پێویستی لەسەر خوێنەر هەبێت.

## پێناسەکانی هەواڵی ڕۆژنامەنووسی
## (Definition Of News)

ئەو پێناسانەی هەواڵ کە لە پێش ناوەڕاستی سەدەی بیستەم لە ئەوروپا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دەرکەوتن زیاتر هەردوو توخمی (وروژاندن و نوێبوون)یان بە پێویست دەزانێ. ئەم پێناسانەش بۆ هەواڵ چەمکی لیبراڵی لەخۆدەگرن و، کۆنترین پێناسەی هەواڵ لە چەمکی لیبراڵیەوە پێناسەکەی (لورد نۆرس کلیف)ە لە ساڵی ١٨٦٥بڵاوکرایەوە کە دەڵێ: (وروژاندن و دەرچوون لە شتە ئاساییەکان) بۆ نموونە (کاتێ کە سەگێك پیاوێك دەگەزێ)، زۆر ئاساییە و هەواڵ نییە، بەڵام گەر (پیاوێك سەگێك بگەزێ) نائاساییە و ئەمەیان هەواڵە، پێناسەیەکی تری لیبراڵی پێناسەی (جوزیف پولیتزر)ە کە دەڵێ: (هەواڵی ڕۆژنامەنووسی بریتییە لە نوێبوون و وروژاندن

و نەوازەو(سەرسوڕهێنەر) و مەرجە ئەم هەواڵانە پەسەند بێت چونکە جێگەی باس و خواستی خەڵکییە.

هەروەها (جیراڵد جونسون) لە پێناسەکەیدا دەڵێ: (باسکردن یان ڕاپۆرت لەسەر ڕووداوێکی بایەخدار لای جەماوەر، لە هەمانکاتدا بایەخدارە لای هەواڵدەری ڕۆژنامەکەوە).

(ئەدیب خزور) بۆ پێناسەی هەواڵ دەڵێ:

(جۆرێکی ڕۆژنامەنووسییە کە ڕوودانی ڕووداوێك بە هاوسەنگی و وردی دەگەیەنێت کە بایەخدارە لای کۆمەڵ).

تێڕوانینی فرایزەر بۆند-یش بۆ هەواڵ پێناسەی دەکا بە:

(ڕاپۆرتێکی ساتیە لەسەر هەر شتێك کە سەرنجڕاکێش بێت لای مرۆڤ، و هەواڵێ باش ئەو هەواڵانەیە کە سەرنجی زۆرترین ژمارەی خوێنەر بۆ لای خۆی ڕابکێشێت و بایەخی پێبدەن).

هەروەها — فارنس فالیز پێناسەی هەواڵ دەکا بە:

(شێوازێکی ڕۆژنامەنووسییە کە هەڵدەستێت بە گواستنەوەی زانیاری دیاریکراو بە شێوەیەکی وابەستە لەسەر ڕووداوێکی بەرجەستەکراو یان خستنەڕووی ڕووداوێکی دیاریکراوە بە شێوازێکی چڕو بە خێراترین ڕێگا و دەبێت ڕاست و وابەستەو بڕوا پێکراو بێت).

نیل ماکنێل-ی یاریدەدەری سەرنووسەری ڕۆژنامەی (نیویۆرك تایمز) بۆ کاروباری دەرەوە لە پێناسەکەیدا دەڵێ: (کۆکردنەوەی ڕاستییەکانە لەسەر ڕووداوە هەنووکەییەکان کە جێی سەرنجی خوێنەرانە بۆ ئەوەی بەدوای ڕۆژنامەکەدا بگەڕێن).

دەتوانرێ پێناسەی هەواڵ بە شێوەیەك پێشکەش بکرێت کە گونجاو بێت لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی سەردەمداو پێناسەی بکەین بە: (هونەرێکی ڕۆژنامەنووسییە باسی ڕووداوێك دەکا کە ڕووی داوە یان ڕوودەدات یان گواستنەوەی لێدوانێکە).



بەکارهێنانی وشەی هەواڵ لە زمانی ئینگلیزیدا واتە (News) پێکهاتووە لە پیتە سەرەتاییەکانی هەر چوار ئاڕاستەکە (پیتی N لە وشەی North وە مانای باکوور و پیتیE لە وشەی East واتای ڕۆژهەڵات و پیتی W لە وشەی West واتای ڕۆژئاوا و پیتی S لە وشەی South واتای باشوور وەرگیراوە).

## توخمەکانی هەواڵی ڕۆژنامەنووسی
## (Elements Of News)

ئەو توخمانەی کە بایەخی هەواڵ دیاریدەکەن بریتین لە:-

١. نوێبوونFresh News: - واتە هەواڵ نوێ بێت چونکە ئەمڕۆ چەرخی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیایەو لە ڕێگەی کەناڵە ئاسمانییەکان و پەخشە نێودەوڵەتییەکانەوە لە ساتی ڕوودانیدا هەواڵەکە دەگەیەنرێت.

٢. بایەخ Importance: واتە جۆری هەواڵەکە بایەخدار بێت بۆ خوێنەر بۆ نموونە:

(زیادکردنی مووچەی خانەنشینان) هەواڵێکی پڕ بایەخە بۆ بەشێکی فراوانی خەڵك و شایانی بڵاوکردنەوەیە.

٣. کات Timing: هەندێ هەواڵ هەیە تەنها لە کاتێکی دیاریکراودا بایەخی هەیە وەك:

(بڵاوکردنەوەی دەمامکی دژ بە چەکی کیمیایی لە بازاڕەکاندا) ئەمە بۆ کاتی ئاشتی هیچ بایەخێکی نییە، بەڵام بۆ کاتی جەنگ بایەخی زۆری پێدەدرێت.

٤. قەبارە Size: ئەو هەواڵەی کە ژمارەی گەورەی تیابێت و قەبارەی گەورە بێت بایەخدارە وەك هەواڵی (ڕووداوی لافاوو ئاوارەبوونی ملیۆنەها مرۆڤ بایەخدارترە لە ڕووداوی لافاوێك کە ١٠ کەس تیایدا ئاوارە بووبێ).

٥. بایەخی مرۆڤایەتی Human Interest : زۆرجار خوێنەر هاوسۆزە لەگەڵ ڕووداوە مرۆڤایەتییەکاندا، ڕووداو یان تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی بێت وەك (ڕفاندنی منداڵێك یان هەرەسهێنانی خانووی ماڵێك).

٦. پێشبینی Consequences: پێوانەی بایەخی هەواڵ لە ڕادەی سەرنجڕاکێشانی خوێنەرەوەیە وا لە خوێنەر بکا پێشبینی هەبێت بۆ بەرەنجامی ڕووداوەکە وەك (پێشبینیکردنی سەرکەوتنی یەکێ لە پارتەکان لە بەدەستهێنانی دەنگی پێویست بۆ زۆرترین کورسی پەرلەمان لە هەڵبژاردنەکاندا).

٧. نامۆو سەرسوڕهێنەر Novelty: هەر هەواڵێك کە لە ئاسایی دەربچێت سەرسوڕهێنەرو وروژێنەر بێت ئەوا بۆ بڵاوکردنەوە دەشێت بەهۆی ئەو نەوازەو دانسقەیەی کە تیایەتی بۆ نموونە: ڕۆژنامەیەکی ئەمریکی هەواڵێکی سەیری بڵاوکردەوە: (ئەستێرەیەکی سەر سنگی ئەفسەرێکی پۆلیس، ئەفسەرەکەی لە فیشەکێکی کوشندە ڕزگارکرد).

٨. ناوبانگ Prominence: زۆرجار خوێنەر بە دوای هەواڵی کەسایەتییە ناودار یان هونەرمەندە دیارەکاندا دەگەڕێ، بۆ نموونە هەواڵی شوکردنی هونەرمەندێك بایەخی زیاتری پێدەدرێت لە شوکردنی کچێکی ئاسایی.

٩. نزیك: Nearness ئەو هەواڵانەی کە لە چوارچێوەی ئەو شارە یان ئەو وڵاتەی کە ڕۆژنامەکەی لێدەردەچێت ڕوودەدات بایەخدارترە لەوانەی کە لە دەرەوە ڕوودەدەن، ئەویش لەسەر گرنگی هەواڵ دەوەستێ.



**شیراك بەرزترین پرد لە جیهاندا دەکاتەوە**

سەرۆکی فەرەنسی جاك شیراك بەرزترین پرد لە جیهاندا دەکاتەوە. کە لەسەر دۆڵی (تارن)، ئەم پردە بەرزییەکەی لە ڕووی زەوییەوە **٢٢٧٠**مەترە و درێژییەکەی **٢,٥٥** کم و، فەرەنسا بە ئیسپانیا و پورتوگالەوە دەبەستێتەوە. ئەندازیاری بەریتانی (نۆرمان فۆستەر) نەخشەی پردەکەی کێشاوە، کە پردەکە بەندە لەسەر حەوت ستوون، بەرزی بەرزترین ستوونیان دەگاتە **٣٤٠** مەتر، واتە **٢٣٣** مەتر لە بەرزی تاوەری ئیڤڵ بەرزترە.

وا چاوەڕوان دەکرێ کە بە هۆی ئەم پردەوە ئاستی بازرگانی و گەشتوگوزار لەنێوان باشوور و باکووری ئەوروپادا بەرزبێتەوە، کە ڕێژەکەی بگاتە بڕی ١٦٠٪ و، شایانی باسە ئەم پردە بە شێوەیەکی کەم وێنە و بە ماوەیەکی کورت تەواو بووە، کە لە ماوەی تەنها **٣**ساڵدا کۆتایی بەم پڕۆژەیە هاتووە و بڕی ٤٠٠٠ ملیۆن دولاری تێچووە.

هەواڵێك کە توخمی دەگمەن و دانسقەی تێدایە و بە شێوازی چوارچێوە هەرەمی سەرەو ژێرکراوی پلەکانە نووسراوە، هەواڵێك کە توخمی گەورەیی تێدایە، بە لە ڕۆژنامەی هاوولاتی لاپەڕە ٩ ژمارە ٣٠٥ ی٢٠٠٦/١٢/٢٠ وەرگیرا شێوازی هەرەمی سەرەوژێرکراو.

چواچێوەی هەرەمی سەرەوژێرکراو:




## خاسیەتەکانی هەواڵی ڕۆژنامەنووسی

١. دەبێت ئەو باس و لێدوانانەی دەیگوێزێتەوە نوێ بێت. نوێبوونی هەواڵ توخمێکی بنەڕەتی و سەرەکییە و بەهاو بایەخی خۆی بۆ خوێنەران هەیە و سەرنجیان بەلای ڕۆژنامەکەدا ڕادەکێشێت بە تایبەت لەم سەردەمەدا کێبڕکێیە لە نێوان ڕۆژنامە ناوخۆییەکان لە لایەك و دەرەکییەکان لە لایەکی تر بۆ ڕاکێشانی خوێنەر بۆ لای خۆیان.

٢. دەبێت ئەو ڕووداوەو لێدوانەی کە ڕۆژنامەنووس باسی دەکات ڕاست بێت، پێویستە ڕووداو و زانیاری و کارەسات و ناو و شوێن و مێژوو و کەسایەتی یان دەزگاکان کە لە کرۆکی هەواڵەکە هاتوون ڕاست و ورد بێت، چونکە باسی درۆ یان گواستنەوەی لێدوان بە قسەی هەڵواسراوەوە کاریگەریی خراپی دەبێت بۆ سەر ناو و ناوبانگی دەزگاکە و کادیرەکانی و بێبڕوایی لای خوێنەر بەرامبەر بەو ڕۆژنامەیە دروست دەکات.

٣. دەبێت ڕووداو سەرنجڕاکێش و بە بایەخ بێت لای ژمارەیەکی زۆری خەڵکەوە، واتە نابێت لە نووسینی هەواڵدا کارەساتەکان بە زمانێکی ڕۆتینی بنووسرێتەوە،



بەڵکو دەبێت بایەخ بدات بە دیمەنی ئالودەی تایبەت بەو کارەسات و ڕووداوەی کە باسی دەکات بۆ ئەوەی هەواڵەکە بایەخدار بێت. پێویستە بە پلەی یەکەم دەربڕی بەرژەوەندی و بیرکردنەوەو سۆزیان بێت و واقعی بێت و ڕاستی بەڵگەداری تیابێت بۆ ئەوەی خەڵك بە پەرۆشەوە بیخوێننەوە

٤. دەبێت بەشێوە زمانێکی سادە و سانا بنووسرێتەوە و ڕستەکانی کورت بن، بەڵام وشەی بەهێز بێت، ئەم توخمە گرنگە بۆ هەواڵ، چونکە نزیکی دەکاتەوە لە بازنەی خوێنەران و بیرکردنەوەیان و بە زمانێکی پاراوی وا بنووسرێتەوە کە هەموو کەس تێیبگات.

## دابەشکردنەکانی هەواڵی ڕۆژنامەنووسی
## (Kinds Of News)

هەواڵی ڕۆژنامەنووسی چەندین جۆری هەیە کە دابەش دەبێت بۆ چەند جۆرێك، یەکەمیان لەسەر بنەمای جوگرافی و دووەم لەسەر بنەمای بابەت و سێیەم لەسەر بنەمای کات و چوارەم لەسەر بنەمای ئامادەکردن و پێنجەم لەسەر بنەمای درێژەی هەواڵ و ئەوی تریش لەسەر بنەمای پێکهاتەیی. هەر بەشێك لەم بەشانە دابەش دەبێت بۆ چەند جۆرێکی تر:

١. **دابەشکردنی جوگرافی بۆ هەواڵ:**

أ- هەواڵی ناوخۆیی: ئەو هەواڵانەیە کە لە ناوخۆی ئەو وڵاتەدا ڕوودەدات کە ڕۆژنامەکەی لێدەردەچێت.

ب- هەواڵی نێودەوڵەتی: ئەو هەواڵانە دەگرێتەوە کە لە دەرەوەی ئەو وڵاتەدا ڕوودەدات کە ڕۆژنامەکەی لێدەردەچێت.

ت- هەواڵی هەرێمایەتی: ئەو هەواڵانە یان لێدوانانەیە کە لە هەرێمی ئەو وڵاتەدا ڕوودەدات کە ڕۆژنامەکەی لێدەردەچێت.

**٢. دابەشكردنی هەواڵ لەڕووی بابەتەوە:**

أ- هەواڵی ڕامیاری: هەموو لایەنەكانی ڕامیاری باس دەكات كە تایبەتە بە سیاسەتی وڵاتان و حكوومەتەكان.

ب- هەواڵی كێشە و ململانێیەكان: ئەو هەواڵانەیە كە لەسەر جەنگ و ململانێ و ناكۆكی نێوان دەوڵەتەكان دەدوێ.

ت- هەواڵی ئابووری: پابەندە بە لایەنی ئابووری و بازرگانی و دارایی وەك هەواڵی دەزگا ئابوورییەكان و بازاڕەكان و سامان و قازانج و نرخی نەوت و كانزاكان.

پ- هەواڵی زانستی: هەموو هەواڵێكە كە تایبەتە بە تەكنەلۆژیاو زانست و زانایان و داهێنان و دەرخستەكان.

ج- هەواڵی ڕۆشنبیری: پابەندە بە جموجوڵی ڕۆشنبیری و ئەدەبی و چالاكییە ڕۆشنبیرییەكان و یانەكان.

ح- هەواڵی هونەری: ئەو هەواڵانەیە كە پەیوەندیان هەیە بە جموجوڵی هونەری وەك هەواڵی هونەرمەند و ئەكتەر و گۆرانیبێژ و شێوەكارو پەیكەرسازو... هتد.

خ- هەواڵی كۆمەڵایەتی: هەموو ئەو هەواڵانەیە كە پەیوەندی بە چالاكی كۆمەڵایەتی و ئافرەت و منداڵ و خێزانەوە هەیە.

د- هەواڵی وەرزشی: ئەو هەواڵانەیە كە پەیوەندی بە گشت چالاكییە وەرزشییەكانەوە هەیە.

**٣. دابەشكردنی هەواڵ لە ڕووی كاتەوە:**

أ – هەواڵی چاوەڕوانكراو: ئەو هەواڵەیە كە ڕۆژنامەنووس چاوەڕوانی ڕوودانی دەكات وەك بەستنی كۆنگرەی ڕۆژنامەنووسی یا بەستنی كۆڕ.

ب – هەواڵی چاوەڕواننەكراو: وەكو هەواڵی ڕووداوە سروشتییە لە ناكاوەكان و كارەسات و سووتان.



**٤. دابەشكردن لە ڕووی ئامادەكردنەوە:**

أ– هەواڵی ئامادەكراو: ئەو هەواڵەیە كە ڕۆژنامەنووس لە بەشەكانی پەیوەندییە گشتییەكان و فەرمانگە و وەزارەتەكانەوە دەستی دەكەوێت.

ب – هەواڵی داهێنراو: ئەو هەواڵانەیە كە ڕۆژنامەنووس توانای خۆی بەكاردەهێنی بۆ دەستكەوتنی وەك هەواڵی گەندەڵی دارایی و ئاشكراكردنی تاوان...هتد.

**٥. دابەشكردنی هەواڵ لە ڕووی درێژەپێدانەوە:**

أ- كورتە هەواڵ: ئەو هەواڵەیە كە ڕۆژنامەنووس تەنها ڕووداوەكە تۆمار دەكات یان زانیارییەكە پێشكەش دەكات بەبێ پێشینەی زانیاری و دەرخستەكان.

ب- درێژە هەواڵ: ئەو هەواڵەیە كە ڕۆژنامەنووس پێشینەی زانیارییەكانی ڕووداوەكە ڕووندەكاتەوە.

**٦. دابەشكردنی هەواڵ لە ڕووی پێكهاتەوە:**

أ – هەواڵی سادە: ئەو هەواڵەیە كە پێكدێت لە زانیاری لەسەر ڕووداوێكی دیاریكراو یان چەند بەشێك لە ڕاو بۆچوون لە یەكێ لە بۆنەكاندا.

ب- هەواڵی لێكدراو: ئەو هەواڵەیە كە چەند زانیارییەكی جیاواز لەخۆدەگرێ و تایبەتە بە چەند ڕووداوێك یان یەك ڕووداو، بەڵام بە شێوەیەكی درێژ.

**دۆزینەوەی ٢٠ مۆمیای ئاڵتونی لە میسر**

وەزارەتی ڕۆشنبیری میسر دۆزینەوەی ٢٠ مۆمیای داپۆشراو بە توێژێكی ئاڵتونی و پەنجا پارچە دراوی زیوینی ڕاگەیاند.

ئەنجوومەنی باڵای ئاسەوار لە ڕاگەیاندنێكیدا وتی: كە لە ناوچەی (وادی مومیاوات) ئەو گەڕانە ئەنجامدراوە بۆ ئاشكراكردنی نهێنی مۆمیا ئاڵتوونییەكان كە ژمارەی ئەوانەی تا ئێستا دۆزراونەتەوە دەگاتە **٢٣٤** مۆمیا و، ئەمینداری گشتی ئەنجوومەنی باڵای ئاسەوار وتی: كە گۆڕێكیش دۆزراوەتەوە هی یەكێ لە خێزانەكانی كاهن (بادی ئیزیس)ە كە دەكاتە نەوەی دادوەری (الواحات البحریە) باپیرەی خەنسووە.

**هەواڵێکی ڕۆشنبیریی لێکدراو بە شێوازی هەرەمی سەرەوژێرکراو نووسراوە:**

خشتەی دابەشکردنی هەواڵ بۆ ڕاهێنانی قوتابی لە دابەشکردنی هەواڵ

| ز | جۆری هەواڵ | دابەشکردنی هەواڵ |
| --- | --- | --- |
| ١ | دابەشکردن لە ڕووی جوگرافییەوە | |
| ٢ | دابەشکردن لە ڕووی بابەتەوە | |
| ٣ | دابەشکردن لە ڕووی کاتەوە | |
| ٤ | دابەشکردن لە ڕووی ئامادەکراوییەوە | |
| ٥ | دابەشکردن لە ڕووی درێژەپێدانەوە | |
| ٦ | دابەشکردن لە ڕووی پێکهاتەوە | |



## سەرچاوەکانی هەواڵی ڕۆژنامەنووسی
## (Sources Of News)

مەبەست لە سەرچاوەکانی هەواڵ ئەو لایەنانەن کە ڕۆژنامەنووس هەواڵیان لێوەردەگرێت ئەوانیش دوو جۆرن:

**١. سەرچاوە ناوخۆییەکان: پەیامنێر و ڕاسپێراو دەگرێتەوە:**

بەم شێوەیە دەتوانین سەرچاوە ناوخۆییەکانی هەواڵی ڕۆژنامەنووسی لەم خاڵانەدا کۆبکەینەوە:

أ- ڕاسپێراو Reporter:

ڕاسپێراو (ئەو ڕۆژنامەنووسەیە کە ڕۆژنامەکە دەینێرێت بۆ لای وەزارەت و فەرمانگەکان بۆ کۆکردنەوەی هەواڵ لەناو ئەو شارەدا کە ڕۆژنامەکەی لێدەردەچێت). ڕاسپێراو گرنگترین سەرچاوەی هەواڵە بۆ ڕۆژنامەو گۆڤارەکان، چونکە پێشدەستی ڕۆژنامەنووسی بە دەستدێنی و بواری سەرکەوتنی بەندە لەسەر ئەو توانایەی کە بەکاریدەهێنێ لەکاتی کۆکردنەوەی هەواڵ و بڵاوکردنەوەیدا، ڕاسپێراو لە بەڕێوەبردنی کارەکانیدا پشت ئەستوورە بەو ئەزموونە ئەکادیمی و ڕۆشنبیری و زیرەکییەی خۆی و ئارەزوومەندی بۆ کاری ڕۆژنامەنووسی، شێوازی کاری ڕاسپێراو و چۆنێتی داڕشتنەوەی هەواڵەکە و بوونی هەواڵی کەموێنە دەبێتە هۆی جیاکردنەوەی ڕۆژنامەیەك لەوی تر، ڕاسپێراو دەبێ شارەزایی هەبێ لە هونەری پەیوەندیی گشتیدا، چونکە چالاکی ڕۆژنامەنووس بەندە لەسەر ئاستی توانای ڕاکێشانی بڕوای خەڵکی بۆ خۆی. لێرەدا پەیوەندی بایەخی خۆی هەیە لە دیاریکردنی سەرکەوتنی ڕاسپێراو لە کارەکەیدا بێجگە لە زیرەکی و خۆڕاگری لە بەردەم هەموو ئەو نارەحەتیانەی کاری ڕۆژنامەنووسیدا و چەندێتی هەستی ڕۆژنامەنووسی و تێڕوانینی ڕاست بۆ ڕووداوە گرنگەکان.

**مەرجەكانی دیاریكردنی ڕاسپێراو:**

١) شارەزایی لە تەكنیكی نووسینی ڕۆژنامەنووسی هەبێت لە (هەواڵ، ڕاپۆرت، چاوپێكەوتن، ڕاپرسی، ڕیپۆرتاژ، وتار، سەروتار، ستوون).
٢) توانای شوێن كەوتنی هەواڵی هەبێت بە تایبەت لەناو ئەو شارەی كە كاری تێدا دەكات و خێرا بگاتە شوێنی ڕووداوەكە.
٣) دۆزینەوەی زانیاری و تۆماركردنی تێبینیەكان.
٤) وردبینی و شیكردنەوەو ڕوونكردنەوەی زانیارییەكان.
٥) وروژاندنی پرسیار.
٦) هێزی تێبینیكردنی خێرا بێت بەچاو و گوێ ئەوەی كە مرۆڤی ئاسایی ناتوانێ دركی پێبكات، ئەو تێیبگات.
٧) دەبێت لە شێوازی نووسیندا بەهرەمەند بن.

ب- پەیامنێر Correspondent:

ئەو ڕۆژنامەنووسەیە كە ڕۆژنامە ڕەوانەی دەرەوەی ئەو شارە یاخود ئەو وڵاتەی دەكات كە ڕۆژنامەكەی لێدەردەچێت بۆ گەیاندنی هەواڵ.

دوو جۆر پەیامنێر هەیە:

١) پەیامنێری ناوخۆیی: ئەو ڕۆژنامەنووسەیە كە لە شارەكانی تر دەمێنێتەوە لە هەمان وڵاتدا كە ڕۆژنامەكەی لێدەردەچێت.
٢) پەیامنێری دەرەكی: ئەو ڕۆژنامەنووسەیە كە لە وڵاتانی دەرەوەیە بۆ دەوڵەمەندكردنی ئەو گۆڤار و ڕۆژنامەیە كە بە هەواڵ و زانیاری كاری بۆ دەكات.

دوو جۆر پەیامنێری دەرەكی هەیە:

أ- پەیامنێری هەمیشەیی: ئەو ڕۆژنامەنووسەیە كە بە شێوەیەكی هەمیشەیی لە وڵاتێك نیشتەجێ دەبێت بۆ ئامادەكردن و كۆكردنەوەی هەواڵی ئەو وڵاتە،



بێگومان پەیامنێری هەمیشەیی پاش بەسەربردنی ماوەیەك لەو وڵاتە زانیاری تەواوی دەبێت سەبارەت بە بارودۆخی سیاسی و ئابووری و كۆمەڵایەتی ئەو وڵاتە و بەو شێوەیە توانایەكی زیاتری دەبێت بۆ شیكردنەوە لێكدانەوەی ڕووداوەكان.

ب- پەیامنێری گەڕۆك: ئەو ڕۆژنامەنووسەیە كە ڕۆژنامە دەینێرێت بۆ وڵاتانی تر لە كاتی ڕووداو و كارەساتی لە ناكاو وەكو جەنگ و كارەساتی چاوەڕواننەكراوو هەڵبژاردن.

**سیفاتەكانی پەیامنێر:**

١) زانینی زمانی ئەو وڵاتە.
٢) كۆكردنەوەی هەموو زانیارییەك لەسەر ئەو وڵاتە.
٣) شارەزایی هەبێ لە نووسینی گشت هونەرەكانی ڕۆژنامەنووسی وەك (هەواڵ، ڕاپۆرت، چاوپێكەوتن، ڕیپۆرتاژ........هتد).
٤) توانای نووسینی هەبێت لە هەموو بوارەكانی ڕۆژنامەنووسیدا (ئابووری، ڕامیاری، هونەری، وەرزشی....هتد).

**٢. سەرچاوە دەرەكییەكان:**

بریتییە لە ئاژانس و ئێزگە و بڵاوكراوە و پەیوەندییە گشتییەكان، سەرچاوەی زیندووی تر وەك پەخشی ناوخۆیی و بیانی یان ڕۆژنامە ناوخۆیی و بیانییەكان و ئاگاداری و بڵاوكراوە فەرمی و میللی و وەزارەت و كۆمیتە و دەزگا گشتی و تایبەتییەكانی تر، ئەم سەرچاوەیە لەوانەیە كەسێك بێت لە كەسایەتییەكی فەرمی یان میللی یان كۆمەڵایەتی یان بیانییەكی پایەدار كاتێ كە سەردانی وڵات دەكات:

### أ- ئاژانسە هەواڵگرییەکان (*) (News Agencies)

ئاژانسە هەواڵگرییەکان بە هۆی بوونی تۆڕێکی فراوان لە پەیامنێران و ڕاسپێراوان کە بە تێکڕای ناوچەکانی جیهاندا بڵاوبوونەتەوە هەواڵ کۆدەکەنەوە، ڕۆژنامەکانیش لە ڕێگەی ئاژانسەکانەوە بەشێکی زۆر لەو هەواڵانەیان دەست دەکەوێت کە هیچ ڕۆژنامەیەك چەندە توانای بەهێز بێت ناتوانێ پەیامنێری هەبێت لە هەموو ناوچەکانی جیهان.

لە بەناوبانگترین ئاژانسەکانی هەواڵگری جیهانی ئەمانەن: (یۆنایتد پرێس ئینتەرناشیۆناڵ –UPA وئاسیۆشێتد پرێس AP)ی ئەمریکی و ئاژانسی ڕۆژنامەنووسی فەرەنسی AFP و ڕۆیتەرز Reuters) دوای جەنگی جیهانی دووەم ژمارەیەك لە ئاژانسی هەواڵگری نیشتمانی دەرکەوتن کە دەکرێ هەر وڵاتە ئاژانسێکی نیشتمانی خۆی هەبێت.

گرنگترین ئاژانە هەواڵگریەکان ئەمانەن:

**١) ئاسیۆشێتد پرێس (AP):**

ئاسۆشێتد پرێس بە گەورەترین ئاژانس هەواڵگری جیهانی دادەنرێت و دەسەڵاتی گەیشتۆتە ئەوەی خاوەنی وێستگە پەخشیەکان و کەناڵە تەلەفزیۆنییەکان لە وڵاتە یەکگرتووەکان و سەدان ڕۆژنامە وگۆڤار و وێستگەی ئێزگەیی و کەناڵی تەلەفزیۆنی

---

(*) دەتوانین ئاژانسە هەواڵگرییەکان بە پێی شوێنی جوگرافی و پیشاندانی دەسەڵاتیان دابەش بکەین بۆ:

١- ئاژانسە هەواڵگرییە نێودەوڵەتییەکان، ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکایی وەك: (ئاسیۆشێتد پرێس و یۆنایتد پرێس ئینتەرناشیۆناڵی و ڕۆیتەرز و فرانس پرێس.

٢- ئاژانسە هەواڵگرییە نیمچە نێودەوڵەتییەکان وەك: (ئاژانسی هەواڵگری ڕووسی ئیتار تاس و کیدۆی ژاپۆنی و شینخوای چینی).

٣- ئاژانسە هەواڵگرییە نیشتمانییەکان: ئەو ئاژانسانەیە کە لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا هەیە و زۆربەی گرنگیپێدانەکەی ناوخۆییە.



لە ناوەو دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا سوود لە خزمەتگوزارییەکانی وەردەگرن بەرامبەر هاوبەشییەکانی ساڵانە کە بڕێك دارایی دەدرێت بە ئاژانسەکە.

ئەو دامودەزگایانەی کە سوود وەردەگرن لە خزمەتگوزارییەکانی ئاسۆشێتد پرێس لە ساڵی ٢٠٠٥ دا گەیشتوونەتە ١٧٠٠ ڕۆژنامە و گۆڤار بێجگە لە ٥٠٠٠ کەناڵی تەلەفزیۆنی و پەخشی ڕادیۆیی، هەروەها کتێبخانەیەکی وێنەی فۆتۆگرافی هەیە زیاتر لە ١٠ ملیۆن وێنەی تێدایە.

ئاسۆشێتد پرێس ٢٤٢ نووسینگەی لە ناوەوە و دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هەیە و خزمەتی دەزگای ڕاگەیاندنی ١٢١ وڵات دەکات و کێبڕکێیەکی توند ڕووبەڕووی بۆتەوە لە لایەن ئاژانسە هەواڵگرییە نێودەوڵەتییەکانەوە وەك ئاژانسی هەواڵگری (فەرەنسی — فرانس پرێس — و ڕۆیتەرزی بەریتانی) و ئاژانسە هەواڵگرییە ئەمریکییەکانی تر وەك (یۆنایتد پرێس ئینتەرناشیۆناڵ و ئیتار تاسی ڕووسی).

نووسەرانی ئاژانسی هەواڵگری ئاسۆشێتد پرێس لە نووسینی هەواڵدا شێوازی چوارچێوەی هەرەمی سەرەوژێرکراو بەکاردێنن بۆ گواستنەوەی ڕووداوەکان بە شێوەیەکی بابەتی و بێلایەنی.

ئاسۆشێتد پرێس بانگەوازی کرد کە لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٦ وە کرێی ئەو وتارنووس و وێنەگرانە زیاد دەکات کە ئاژانسەکە دەوڵەمەند دەکەن بە وتار و وێنەی دەگمەن، ئەم ئاژانسە لە ساڵی ١٨٤٦ دا لە لایەن نوێنەرانی پێنج ڕۆژنامە و لە شاری نیویۆرك دامەزراوە و ئامانجەکەشی کۆکردنەوەی هەواڵە لە ئەوروپا لە ئەنجامی ئەو بانگهێشتەی کە خاوەنی گۆڤاری (هەتاو (sun) نیویۆرك)، کاتێ کە داوای لە دەزگای بڵاوکردنەوەی پێنج ڕۆژنامەی نیویۆرکی کرد بۆ چوونە پاڵ گۆڤارەکە بۆ داپۆشینی هەواڵی جەنگی هەڵگیرساوی نێوان وڵاتە یەکگرتووەکان و مەکسیك.

هەر پێنج ڕۆژنامەکەی نیویۆرك هاوبەشیان کرد لە ڕێککەوتنێکدا لەگەڵ گۆڤارەکەدا بۆ داپۆشینی هەواڵی ئەو پاپۆڕانەی کە لە ئەوروپاوە دێن.

**٢) ئاژانسی هەواڵگری یوٚنایتدپرێس ئینتەرناشیوٚناڵ UPI:**

ئەم ئاژانسە بە یەکێ لە گرنگترین ئاژانسەکانی جیهان دادەنرێت لە پاڵ ئاسوٚشیت پرێس و رۆیتەرز و فرانس پرێس. ئاژانسی ئاسۆشێتدپرێس ئینتەرناشیوٚناڵ لە بەرواری ٢١ / حوزەیران /١٩٠٧ لە لایەن دەزگای سکریپس Scripps بۆ رۆژنامەگەری یەکگرتوو دامەزرا بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری هەواڵگری ئازاد بۆ دەزگاکانی راگەیاندن پاش ئەوەی ئاژانسی ئاسۆشێتد پرێس فرۆشتنی خزمەتگوزاریەکانی رەتکردەوە بە هەندێ لە رۆژنامەو دەزگاکانی راگەیاندن، ئەم ئاژانسە نوێیە رووبەرووی کێبڕکێیەکی زۆر لە لایەن ئاژانسە هەواڵگرییە نێودەوڵەتییە گەورەکانەوە بۆتەوە.بەڵام توانی وەکو ئاژانسێکی هەواڵگری جیهانی دەربکەوێت و ٥٠٠٠ هاوبەشی هەبێت و ١٠٠٠ ئەو هاوبەشانە پێکهاتبوون لە رۆژنامە رۆژانەیی و هەفتەییەکان.

**٣) ئاژانسی هەواڵگری رۆیتەرز Reuters:**

کۆچکەری ئەڵمانی لە لەندەن رۆیتەر پۆڵ جولیوٚس بە دامەزرێنەری ئەم ئاژانسە لە ساڵی ١٨٥١ دادەنرێت. لە سەرەتادا کاری ئاژانسەکە تەنها بەرهەمی بازاڕی بەشی دراوەمەنی دەنارد لە نێوان پاریس و لەندەنداو لە رێگەی هێڵی بروسکەوە (سلك برقیە کالیە دۆفر) ئاژانسەکە لە ئەوروپا ناوبانگێکی باشی دەرکرد بە هۆی بڵاوکردنەوەی هەواڵی بایەخداری وەکو (تیرۆرکردنی ئەبراهام لینکۆن) و رێژەیەکی زۆری رۆژنامە جیهانییەکان پشت دەبەستن بە هەواڵی رۆیتەرز.

پەیامنێری لە ٢٠٠ شاردا هەیە لە تێکڕای ٩٤ وڵاتدا و خزمەتگوزارییەکانی بە ١٩ زمان پێشکەشدەکات بە دەزگاکانی راگەیاندن.



**٤) ئاژانسی هەواڵگریی فەرەنسی France press:**

کۆنترین ئاژانسی هەواڵگرییە لە جیهاندا کە ساڵی ١٨٣٥ لە لایەن چارلس لویس هاڤاس-ەوە دامەزرا و بە پلەی سێیەم دێت لە پەسەندترین ئاژانسە هەواڵگرییە جیهانییەکاندا دوای ئاژانسەکانی ئاسۆشێتدپرێس و رۆیتەرز، بارەگاکەی لە پاریسەو مەڵبەندی هەرێمایەتی لە واشنتۆن و هۆنگ کۆنگ و نیقوسیا و مۆنتیفیدیو هەیە و هەروەها لە ١٠ وڵاتدا نووسینگەی هەیە و هەواڵ بە دەزگاکانی راگەیاندن بە زمانەکانی (ئەڵمانی و ئیسپانی و عەرەبی و ئینگلیزی و فەرەنسی و پورتوگالی و رووسی) دەفرۆشێ و لەلایەنی بەڕێوەبردنەوە بە کۆمپانیایەکی سەربەخۆ دادەنرێت، لە سەرەتادا ١٥ نوێنەر بەڕێوەیان دەبرد بەم شێوەیە:

٨ نوێنەر لە رۆژنامەکانی فەرەنسا

٢ نوێنەر لە کارمەندانی A. F.B

٢ نوێنەر لە خزمەتگوزاری حکومی.

٣ نوێنەر لەو خزمەتگوزارییە حکومییانەی کە هاوبەشبوون لە ئاژانسەکەدا (١نوێنەری سەرۆك وەزیران و ١ نوێنەری وەزیری دارایی و ١ نوێنەری وەزیری دەرەوە) دەیانپاڵێوێ.

**٥) ئاژانسی هەواڵگریی کیدۆ Kyodo:**

بارەگای ئاژانسی هەواڵگری کیدۆی ژاپۆنی دەکەوێتە پایتەختی ژاپۆنەوە، ئاژانسێکی هەواڵگری هەرەوەزی دوور لە قازانجە. لە ساڵی ١٩٤٥دا دامەزراوە، هەواڵ بەسەر زۆربەی رۆژنامەکانی ژاپۆن و وێستگەی پەخشەکان و کەناڵە تەلەفزیۆنییەکان دابەشدەکات، زیاتر لە ٥٠ ملیۆن ژاپۆنی سوودمەند دەبێت لە هەواڵ و راپۆرت و بابەتەکانی ئەم ئاژانسە لە کاتی بڵاوکردنەوەیاندا لە رۆژنامە و گۆڤار و وێستگە پەخشییەکاندا و کەناڵە تەلەفزیۆنییەکاندا.

**٦) ئاژانسی هەواڵگریی رووسی Itar tass:**

ئاژانسی ئیتار تاسی رووسی بە ئاژانسێکی بروسکەیی رووسی دادەنرێت و بارەگاکەی لە پایتەختی مۆسکۆیە. بیرۆکەی دامەزراندنی ئەم ئاژانسە لەو نامەیەوە هات کە وەزیری دارایی ڕووسی ئەو کاتە (فلادیمێر کۆکۆفتسۆڤ) بۆ وەزیری دەرەوەی نارد لە ٢٦/ئازاری / ١٩٠٤دا و کرۆکی نامەکە بریتی بوو لە (فەرمانگە بازرگانی و پیشەسازییەکان بێجگە لە وەزارەتی دارایی هەمیشە پێویستی بە ئاڵوگۆڕی زانیارییە بە بروسکە لەگەڵ وڵاتانی بیانی هەیە بۆ گەشەپێدانی بازرگانی ناوخۆیی) لە تەمووزی ساڵی ١٩٠٤ دا کۆبوونەوەیەك بەسترا بۆ دامەزراندنی ئاژانسێکی بروسکەیی فەرمی بە ناوی ئاژانسی بروسکەیی پوترس پۆرگ (St Petersburg) کە ئامانجی ئاڵوگۆڕکردنی هەواڵی ئابووری ودارایی و ڕامیاری و بازرگانی و زانیاری تر بێ لە ١٩٠٤/٩/١ دا دەستی بە کارەکانی کرد و لە ١٩١٤/٨/١٩ دا ناوی ئاژانسەکە گۆڕا بۆ ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی و لە ١٩١٧/١/١ ناوی گۆڕا بۆ (ئاژانسی زانیاری ناوەندی) و لە ١٩١٨/٩/٧ ئاژانسی زانیاری ناوەندی لەگەڵ نووسینگەی سۆفنارکۆم Sovnarkom ی ڕۆژنامەنووس یەکیگرت و ناوەکەی گۆڕا بۆ ئاژانسی برووسکەیی ڕووسی، لە ٢٥/تەمووزی / ١٩٢٥ ناوەکەی گۆڕا بۆ (ئاژانسی بروسکەیی یەکێتی سۆڤیەت).

لە ساڵی ١٩٩٢ پاش هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤیەت ئیتار تاس بوو بە میراتگری ئاژانسی بروسکەیی ڕووسی و تا ئێستا ئاژانسەکە دەزگایەکی حکوومییە و هەواڵ بەسەر ٧٠٠ ڕۆژنامەدا دابەشدەکات و ٧٤ نوسینگەی هەیە لە ڕووسیا و کۆمارەکانی سۆڤیەتی سەربەخۆدا و ٦٥ نووسینگەی لە ٦٢ وڵاتی بیانیدا هەیە.

**٧) ئاژانسی هەواڵگری شینخوا:**

ئاژانسی هەواڵگری چینی (شینخوا ئاژانسێکی هەواڵگری فەرمی حکوومەتی کۆماری چینی میللییە و گەورەترین مەڵبەندی کۆکردنەوەی زانیاری و کۆنگرەی ڕۆژنامەنووسییە).



شینخوا سەر بە ئەنجوومەنی فەرمی چینە و ڕەخنەگران شینخوای بە ئامرازێکی پڕوپاگەندەی ناودەبەن کە لە لایەن دەوڵەتی چینەوە پشتگیری دەکرێ. ئێستا زیاتر لە (١٠٠٠٠) دە هەزار دەزگا سوودمەند دەبن لە خزمەتگوزارییەکانی ئاژانسەکە بەبەراورد لە گەڵ ١٣٠٠ دەزگا کە خزمەتگوزاری ڕۆیتەر بەکاردەهێنن. شینخوای لە تێکڕای جیهاندا ١٠٧نووسینگەی هەیە. ٣١ نووسینگەی لە چین واتا هەر پارێزگایەکی چین نووسینگەی تێدایە بێجگە لە نووسینگەی سەربازی. ئەم ئاژانسە خاوەنی ٢٠ ڕۆژنامەیە و ژمارەیەك گۆڤار بە زمانەکانی (ئینگلیزی و چینی و چوار زمانی تر) دەردەکات.

ئاژانسی هەواڵگری شینخوای لە تشرینی دووەمی ١٩٣١ دا بە ناوی ئاژانسی هەواڵگری چینی سوور دامەزرا و ساڵی ١٩٣٧ ناوەکەی گۆڕا بۆ شینخوا و لە ساڵی ١٩٤٤ دەستیکرد بە فرۆشتنی خزمەتگوزارییەکانی بە دەرەوە. ئێستا شینخوا خزمەتگوزارییەکانی بە حەوت زمان دەفرۆشی (عەرەبی – ئیسپانی – ڕووسی – فەرەنسی – ئینگلیزی – چینی) بێجگە لە وێنە و هەواڵی ڕامیاری و ئابووری و وەرزشی جۆراوجۆر.

**ب – پەخشە ناوخۆیی و بیبیانییەکان:**

پەخشە ناوخۆیی و بیبیانییەکان سەرچاوەیەکی گرنگی هەواڵن بە تایبەت بۆ ئەو وڵاتانەی کە پەخشەکانیان زمانحاڵی حکوومەت و دەسەڵاتە و دەربڕی ئاراستە فەرمییەکانی دەوڵەتە.

لەبەر بایەخی پەخشە بیانییەکان وەکو سەرچاوەی هەواڵ، ئاژانسەکانی هەواڵ و ڕۆژنامە فرە بڵاوەکان، بەشی گوێبیستنیان پێکهێنا، کە بریتییە لە ئامێری پێشوازیکردن و تۆمارکردن، کە لە ڕێگەیانەوە هەموو هەواڵی کەناڵە ئێزگەییەکان لە سەرانسەری جیهاندا بڵاودەبێتەوەو تۆماری دەکەن.

**ت- ڕۆژنامەی ناوخۆیی و بیانی:**(*)

زۆر جار ڕۆژنامە یا گۆڤارێکی ناوخۆیی یان بیانی هەواڵێکی بایەخدار یان بەڵگەنامەیەکی بە بایەخ بڵاودەکەنەوە کە لە هیچ سەرچاوەیەکی تر بڵاونەبۆتەوە بۆیە ڕۆژنامەکانی تر دەیگوێزنەوەو فراوانتری دەکەن و لێدوانی تایبەتی لە سەرچاوەی تایبەتییەوە یان لە ڕێگەی چاوپێکەوتن و گفتوگۆی ڕۆژنامەنووسیەوە لە گەڵ سەرۆکە ناوخۆیی یا بیانییەکانەوە لەسەر بڵاودەکەنەوە.

**پ- بڵاوکراوەکان:**

جاروبار بڵاوکراوەی تایبەت دەردەچێت لە لایەن (وەزارەتەکان، کۆمپانیا حکومی و میللییەکان، دەستە نێودەوڵەتییەکان، باڵوێزخانەو، نوسینگە ڕۆشنبیرییەکان و ڕۆژنامە ناوخۆیی و بیانییەکان) و دەبنە سەرچاوەیەکی بایەخداری زۆر هەواڵی ڕۆژنامەنووسی.

**ج- کۆنگرەی ڕۆژنامەنووسی Press Conference:**

کۆنگرەی ڕۆژنامەنووسی بریتییە لەو لێدوان و بۆچوونانەی کە سەرۆك یان کەسایەتییە بەرپرسەکان دەریدەبڕن لە کاتی ئامادەبوونی کۆمەڵێك ڕۆژنامەنووس ئەمەش بە مەستی شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی سیاسەتێکی نوێ یا دارشتنی یاسا یان گفتوگۆکردنی مەسەلەیەك هەرکاتێك پێویست بکات کە بایەخدارە بۆ ڕای گشتی، بۆ ئەوەی زانیارییەکان بە خێرایی بگاتە جەماوەرێکی فراوان.

(*) سێ جۆر ڕۆژنامە هەیە بەگوێرەی فراوانی بڵاوکردنەوە: ١- ڕۆژنامەی ناوخۆیی/ ئەو ڕۆژنامەیەیە کە لە یەکێ لە ناوچەکاندا دەردەچێت و تێیدا بڵاودەکرێتەوەو ژمارەی چاپەکانی لە ١٠٠٠٠دانە دەرناچێت.٢- ڕۆژنامەی نەتەوەیی /ئەو ڕۆژنامەیەیە کە لە چوارچێوەیەکی فراواندا و بە زمانی دانیشتوانی ژمارەیەك لە ناوچەی جوگرافیەکانی دەوروبەری دەردەچێت وەکو ئەو ڕۆژنامانەی لە کوردستان دەردەچێت و دەگاتە دەستی ئەو کوردانەی لە سوریا و ئێران و تورکیا نیشتەجێن.٣- / ڕۆژنامە نێودەوڵەتییەکان / ئەو ڕۆژنامانەیە کە لە وڵاتێك دەردەچێت، بەڵام لە وڵاتانی تر بڵاودەکرێتەوە و زۆرجار بە زمانەکانی ئەو وڵاتانە وەکو (ووڵ ستریت).



پێویستی بەستنی کۆنگرەی ڕۆژنامەنووسی لەو کاتەدایە کە بەرپرس یان سەرۆك کاتی نییە هەر ڕۆژنامەنووسێك بە تەنیا چاوپێکەوتنی لەگەڵ بکات بۆ ئەوەی زۆرترین ژمارەی ڕۆژنامەنووس وەڵامی پرسیارەکانیان دەست کەوێت لە کەمترین کاتدا و تەنها کۆنگرەی ڕۆژنامەنووسیش چارەسەرە بۆ ئەوە.

**ح- وەزارەتەکان و دەزگا فەرمییەکان Ministries:**

زۆرجار هەواڵ لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاودەکرێتەوە کە سەرچاوەکانی بریتین لە (وەزارەت و دەزگا فەرمی و کۆمپانیا و دەزگا گشتی و تایبەتییەکان و بەشەکانی پۆلیس و دادگا و سەندیکاکان و نەخۆشخانە و پەخش و تەلەفزیۆن و شانۆ و ئوتێل و یانەکان و فرۆکەخانە و هۆیەکانی گواستنەوە).

**خ- سەرچاوەکانی دی:**

لەو سەرچاوانەی پێشتر ئاماژەی بۆ کراوە تەنها سەرچاوەی هەواڵ نین، هەندێ سەرچاوەی دیکەی هەواڵ بە پێی سروشتی هەر ڕۆژنامەیەك و تایبەتمەندێتی و ڕەنگی ڕامیاری و سیاسەتی نووسین، هەن لەوانە:

١) هاوڕێ و برادەر و یارمەتیدەرانی کەسایەتییە دیارەکانی لە ناو کۆمەڵگادا.
٢) ئاهەنگ و ڤیستیڤاڵ و لیژنە فەرمی و میللییەکان.
٣) گۆڤارە تایبەتمەندەکان.
٤) ئاگاداری و پڕوپاگەندەکان.
٥) ڕێکەوت: زۆر هەواڵ هەیە ڕۆژنامەنووس بەبێ ئەوەی نەخشەی بۆ دانابێ بە ڕێکەوت دەستی دەکەوێ.
٦) ئینتەرنێت و ڕۆژنامە ئەلەکترۆنییەکان، کە بە هۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاوە ئەمڕۆ سەرچاوەیەکی سەرەکین.

## قوتابخانەکانی هەواڵ
## Schools of News

**أ- قوتابخانەی ئاوێنەیی:**

لایەنگرانی ئەم قوتابخانەیە وای بۆ دەچن کە هەواڵ وەکو ئاوێنەیە و ڕووداوێکی دیاریکراو دەخاتە ڕوو. ڕۆژنامەنووس و پەیامنێران چاودێری و پێشبینی جیهانی دەوروبەریان دەکەن و تێبینی بابەتی و ورد دەخەنەڕوو وەك خۆی سەبارەت بەو ڕووداوانەی کە دەیبینن، وەك چۆن ئاوێنە ڕاستگۆیە لە خستنەڕووی ئەو وێنەیەی کە لەبەردەمیدایە. هەروەها لایەنگرانی ئەم قوتابخانەیە بەو گووتەیە بەرگری لە بیروڕای خۆیان دەکەن و دەڵێن (ئێمە هەواڵ دروست ناکەین بەڵکو تەنها دەیگوێزینەوە) واتە ئەوانەی کە بە دوای ڕووداوەکاندا دەڕۆن و باسیان دەکەن تەنها کەناڵە زانیارییەکانن و خەڵکانی تر ڕووداو بەرهەمدێنن و ئەمانیش هەر شتێك بەرچاویان بکەوێ لەسەر ڕووداوەکە دەیخەنەڕوو. دەزگاکانی ڕاگەیاندن بە زمانی ئینگلیزی کە بابەتییانە هەواڵ ڕادەگەیەنن، بە پێی چەمکی ئەم قوتابخانەیە کار دەکەن (ڕۆژنامەنووس کە باسی ڕووداوێك دەکات یان لێدوانێك دەگوێزێتەوە وەکو خۆی. ئیتر شیکردنەوە و لێکدانەوەی بۆ ناکات).

**ب- قوتابخانەی پیشەیی:**

کەسانی سەر بەم قوتابخانەیە تێڕوانینیان بۆ دروستکردنی هەواڵ بریتییە لەوەی کە (کەسانێکی شارەزا و لێهاتوو پێی هەڵدەستن بە دانانی ئەو ڕووداوانەی کە هەڵیانبژاردووە لەڕووی گرنگی و بایەخدانی جەماوەر پێیان یان بە هۆکاری ئابوورییەوە. بە گوێرەی ئەم قوتابخانەیە بایەخی یەکەمی هەیە. واتە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بە پلەی یەکەم ئاراستەو داواکانی جەماوەر لە بەرچاو دەگرن و پارێزگارییان لێدەکەن، بۆیە ئەوەی لەگەڵ ویستی خەڵکدایە بڵاودەکرێتەوە و پێشوازی



لێدەکرێ، بەڵام بە پێچەوانەی ئەمە فەرامۆش دەکرێ. بێگومانین لەوەی کە شارەزایانی بواری ڕۆژنامەنووسی بە ئەزموونن لە چۆنێتی دواندنی جەماوەر و جێبەجێکردنی داواکانیان و سەرنجڕاکێشانیان هەروەها خۆڕاگرن بەرامبەر ئەو گوشارە ناوخۆیی و دەرەکییانەی کە تووشی دەبن بۆ دەرهێنانی هەواڵێك یان بابەتێك بەو شێوەیەی کە خۆی دەیەوێ و خزمەتی بەرژەوەندی و ئامانجەکانی دەکات. بەڵام ئەمە پێچەوانەی داب و نەریتە چەسپاوەکانی ڕۆژنامەنووسییە لە ژووری هەواڵەکان. لەبەرئەوە ڕۆژنامەنووسی شارەزا تێڕوانینی وایە کە هەواڵ لەگەڵ ئەوەی بە خزمەتێکی کۆمەڵایەتی دادەنرێت و سوودمەندی یەکەم جەماوەرە لە هەمانکاتدا کاڵایەکە و ملکەچی ململانێ دەبێت.

**ت- قوتابخانەی دەزگایی:**

لایەنگرانی ئەم قوتابخانەیە پێیان وایە کە ڕووداوەکان دیاری بکەن و کۆیبکەنەوە بە لەبەرچاوگرتنی ئەو گوشارەی کە دەزگاکە و تواناکەی تووشی دەبن، هەواڵ بایەخی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی گوشاری کارە هونەرییەکان لە بەرهەمهێنانی هەواڵدا و بایەخدان بە دەستکەوت و زیانی بڕی خەرجی ئەو کارەو کاریگەریی دەزگایی هەواڵ لە سیاسەتی نووسینی هەموو ڕۆژنامەیەکی بەربڵاودا دەردەکەوێت.

بە لەبەرچاوگرتنی ناوەڕۆکی (ڕێبەری شێوازی کار) ئەم ڕێبەرە کە هەندێ جار بە (کتێبی گیرفان) * ناوزەد دەکرێت پێکهاتووە لە ڕێنمایی زمانەوانی و شێوازی نووسین و ڕێگای جێگیر (برواپێکراو) لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ڕووداوەکاندا بە جیاوازی جۆرەکانییەوە و نەریتی ئامرازی هەواڵنێری لە ئامادەکردنی هەواڵ و دابەشکردنیدا.

**پ- قوتابخانەی ڕامیاری:**

لایەنگرانی ئەم نموونەیە لە هەواڵ تێڕوانینیان وایە کە (هەواڵ لە هەر شوێنێك بێت ئەنجامی ئارەزووی ئایدۆلۆژیای هەواڵنێرەکەیە، هاوکات لەگەڵ گوشاری ئەو دۆخە ڕامیارییەی کە دەزگای هەواڵ لە سایەیدا کار دەکات، کاتێك هەلومەرجێکی دیموکراسیانە، کە بایەخ بە سەرپەرشتی کۆمەڵایەتی دەدا لە ئارادا بێت، ئەوا ئەو بۆچوونە لە تێڕوانین بۆ جیهان و مامەڵەکردن لەگەڵ ڕووداودا، ڕەنگدەداتەوە..بەپێی ئەم نموونەیە سیاسەتمەداران خۆیان بە پاڵەوانی هەواڵ دەزانن لایان وایە پەیامنێران و ڕاسپێراوان لە چوارلایان کۆدەبنەوە، بەڵام ئەوانەی پلەو پایەیان بە نزم دادەنرێ بە گشتی فەرامۆش دەکرێن.

ئەمەش لەو هەواڵانەدا دەردەکەوێت کە دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەو وڵاتە سۆسیالیستەکان و تازە پێگەیشتووەکاندا بڵاویدەکەنەوە. ئامانجی دروستکردنی ڕای گشتییە، لەم وڵاتانەدا کاری ڕۆژنامەنووسی هاوکاریکردنی دەوڵەتە یان پارتی دەسەڵاتدارە لە جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتەی کە خزمەتی دەسەڵات دەکات.



## بنەماکانی نووسینی هەواڵی ڕۆژنامەنووسی(*)
## Foundations of Writing News

کاری ڕۆژنامەنووسی هونەرێکە پشت بە چێژێکی ڕاست و دروست و داهێنان و زیرەکییەکی وابەستە بە ڕۆشنبیرییەکی فراوان دەبەستێ بەو چەشنەی کە تێکەڵاوبوونێك لە نێوانیاندا دروست دەکات لە گەڵ پابەندبوون بەم بنەمایانە:

١. ڕۆژنامەنووس پێویستە پێش ئەوەی باسەکەی بنووسێ و وتەکان بگوێزێتەوە بۆ ناو هەواڵەکە و تێگەیشتنی تەواوی هەبێت بۆ ڕووداو و لێدوان و گفتوگۆکان بە هەموو وردەکارییەکانەوە.
٢. قەبارەی ئاسایی بە هەواڵەکە بدا و بابەتیانە پێشکەشی بکات بە بێ زیادەڕەوی و بەلاوەخستنی بەڵگەکان و بە پێی ڕیزبەندی شەش پرسەکە و شێوە نووسینی چوارچێوەی هەواڵ.
٣. هەڵبژاردنی وشەی گونجاوی زمانەوانی بۆ دەربڕینی باسکردنی ڕووداوەکە بە کەمترین ژمارەی وشە و بە پشتبەستن بەو وتەی (خیر الکلام ما قل و دل).
٤. لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ هەواڵی کەسایەتییەکان یاخود لێدوانەکانیان پێویستە ئەو زاراوانە لە بەرچاو بگیرێت کە بۆ ئاستە وەزیفییەکان و پایە سەرکردایەتییەکان بە کاردێت.
٥. لە کاری ڕۆژنامەنووسیدا بواری داهێنان لە نووسیندا هەیە، بەڵام بەمەرجێك ڕیزبەندی شەش پرسەکە و چوارچێوەی نووسینی هەواڵ بەکاربهێنرێت.

(*) هەندی ڕۆژنامە هەیە کە پشت دەبەستێت بە (ڕێبەری شێوازی کار) ئاژانسی هەواڵگری ئاسۆشیێتد پرێس (AP) کە کاریگەری ئاشکرای بە جێهێشتووە لە شێوازی نووسینی هەواڵدا. لە شەستەکاندا چاپکراوەو بەکارهێنانی بڵاوبۆتەوە لە دەزگا جۆربەجۆرەکانی ڕاگەیاندندا. بڵاوبوونەوەی بەکارهێنانی ڕێبەری شێوازی کار بەڵگەی پاراستنی دەزگای هەواڵگری و ڕۆژنامەیە بۆ جیاکاری و شارەزایی دروستکردنی هەواڵ و لە بەرچاوگرتنی بنەماکانی نووسین و پێوانەی شێواز و ئەمەش بۆ خۆی ئاماژەیە بە ئەوەی کە نووسینی هەواڵ بووە بە پیشەسازییەك شارەزایی و وردە و تایبەتمەندێتی جیاوازی هەیە.

## شەش پرسیارەکە

١- کێ who؟ هەموو ئەو ناوانەی کە پەیوەندییان هەیە بە هەواڵەکەوە بە گوێرەی شوێن و پلە و لێدوانەکە یان وتەکانیان یا ناوی لایەن و دەوڵەت و ڕێکخراو یاخود دەزگا.

٢- چی what ؟ بایەخ دەدا بە بابەتی هەواڵەکە ئیتر چالاکی بێت یاخود ڕووداو یان کێشە.

٣- کەی when؟ کاتی ڕووداوەکە.

٤- لە کوێ where؟ شوێنی ڕووداوەکە.

٥- بۆ why؟ هۆی ڕوودانی ڕووداوەکە.

٦- چۆن how ؟ چۆنێتی ڕوودانی ڕووداوەکە.

## چوارچێوە تەکنیکییەکانی نووسینی هەواڵ ڕۆژنامەنووسی

نووسینی هەواڵ بە سێ شێواز دەنوسرێ:

١. **چوارچێوەی هەرەمی سەرەوژێرکراو:**

ئەم شێوازە بەکار دێت بۆ باسکردنی ئەو ڕووداوەی کە ڕوویداوە وەکو (سەردانی یەکێ لە بەرپرسان بۆ وڵاتێك) یان ئەو ڕووداوەی بەو نزیکانە ڕوودەدات وەکو (سازکردنی کەرنەڤاڵ پاش چەند ڕۆژێکی تر).

بنەمای هەواڵ لێرەدا دەکرێت بە دوو بەشەوە:

پێشەکی و کرۆك

أ- پێشەکی سەرەتای باسکردنی ئەوەی ڕوویداوە یان بەم نزیکانە ڕوودەدا.

ب- کرۆکی هەواڵ درێژەی هەواڵەکە لەخۆدەگرێ لە گرنگترینەوە بۆ کەمترین گرنگی.






هەواڵ بە شێوازی چوارچێوەی هەرەمی سەرەوژێرکراو

جیمس بیکەر لە وەزارەتی ناوخۆی عێراق

بەغداد / الشرق الاوسط

وەزیری ناوخۆی عێراق جەواد بۆلانی دوێنی لە نووسینگەکەی خۆی پێشوازی کرد لە جیمس بیکەر وەزیری دەرەوەی ئەمریکا و وەفدە یاوەرەکەی کە ئێستا سەردانی عێراق دەکات و لەو چاوپێکەوتنەدا پۆلانی لەگەڵ میوانەکان باسی گۆڕانکارییەکان و دۆسیەی ئاسایش و ئەو هەوڵانەی کە هێزەکانی ئاسایشی عێراق ئەنجامیان داوە بۆ قەلاچۆکردنی تاوان و لە ناوبردنی تیرۆریستان و پێکهێنانی دەوڵەتی یاساو دام و دەزگا. لای خۆیەوە جیمس بیکەر پشتگیری ئەو ماندووبوونەی حکومەتی عێراقی کرد.

گرنگترین لێدوان

هەواڵێك بە شێوازە چوارچێوەی هەرەمی سەرەوژێرکراو

دەستگیرکردنی زیاتر لە ٢٠ کەس داواکرابوون لە کەرکوك
لیوا شێرکۆ شاکر سەرکردەی پۆلیسی کەرکوك ڕایگەیاند کە شەوی ڕابردوو مەفرەزەکانی پۆلیس هەڵسان بە دەستگیرکردنی زیاتر لە ٢٠ تیرۆریست لە کاتێکدا هەڵمەتێکی پشکنینیان ئەنجامدا بۆ گەڕەکی قادسیە. ئەمەی لە لێدوانێکدا باسکرد بۆ گۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسی کە لە بینای بەڕێوەبەرێتی پۆلیسی کەرکوك بەسترا بە ئامادەبوونی ژمارەیەك ئەفسەری پۆلیس هەروەها دووپاتی کردەوە کە لە ناویاندا هەیە لە لایەن هێزەکانی پۆلیسەوە داواکرابوون بە هۆی ئەنجامدانی کاری تیرۆریستییەوە لە ناو شاردا هەروەها وتی سوودمان لەو زانیارییانە وەرگرتووە کە هاووڵاتیان پێیان گەیاندوین بۆ دەستگیرکردنیان.

گرنگترین درێژەی هەواڵ

لێدانی گرنگی

کەمترین درێژەی گرنگ

کوژرانی ٥ هاووڵاتی لە ئەنجامی تەقینەوەی ئۆتۆمبێلێکی مینرێژکراودا.
لە بەغداد لە ئەنجامی تەقینەوەی ئۆتۆمبێلێکی مینرێژکراودا، ٥کەس کوژران و ١٠ کەسی تریش بریندار بوون، لە کاتی تێپەڕبوونی ڕەتلێکی پۆلیسی عێراقیدا، شایانی باسە کارە تیرۆریستییەکان کە ئامانجیان هاووڵاتیانی بێتاوانە لە بەغداد زیادی کردووە.



ئەم جۆرە بە باشترین شێواز بۆ باسکردنی ڕووداوەکان بە هەموو جۆرەکانییەوە لە نێوان شێوازەکانی تردا دادەنرێت بەوەش جیادەکرێتەوە بەوەی وردو درشتی هەواڵ ڕاستەوخۆ بۆ خوێنەر دەگوێزێتەوە هەر لە بڕگەی یەکەمەوە خوێنەر ئەمە پەسەند دەکات چونکە ئارەزووی زانینی کورتەیەك دەکات.

**٢. چوارچێوەی هەرەمی سەرەوژێرکراوی پلەکانە:**

بنەمای هەواڵ لەم شێوازە پشت بە بڵاوکردنەوەی لێدوانەکان دەبەستێ وەك:

ا- کەسایەتی ناودارو گرنگ لە کۆمەڵگادا.

ب- بەرپرسانی پەیوەندییە گشتییەکان.

ت- وتەبێژی ڕاگەیاندن بە ناوی یەکێ لە دەزگاکان یان ڕێکخراوەکان.

ڕۆژنامەنوس چەند بڕگەیەکی گرنگ لەو لێدوانە دەخاتە ڕوو ئەو ڕاگەیاندنەش ئەم خاڵانە دەگرێتەخۆ:

١) ڕووداوێکی گرنگ بە نیسبەت کۆمەڵگا.
٢) ئەو ڕاو بۆچوونانەی بە نیسبەت کۆمەڵگاوە گرنگە.
٣) زانیاری تایبەت بەو کەسەی ڕاگەیاندنەکە ساز دەکات.
٤) ڕۆژنامەنووس بونیاتی هەواڵەکە بە پێی چوارچێوەی هەرەمی سەرەو ژێرکراوی پلەکانە دادەڕێژێتەوە.

کاروباری دەرەوەی یابانی: کشانەوەی هێزەکانمان لە عێراق بەستراوە بە بارودۆخی ئەمنییەوە وتەبێژێك بەناوی وەزارەتی دەرەوەی یابانەوە دووپاتی کردەوە کە کشانەوەی هێزەکانیان لە عێراق بەستراوە بە باشبوونی بارودۆخی ئەمنیەوە هەروەها وتی لەوکۆنگرە ڕۆژنامەنووسییەدا کە لە تۆکیۆی پایتەختی ژاپۆن بەسترابوو مانەوەی هێزەکانیان لە عێراق پەیوەستە بە بڕیارێکی نێودەوڵەتییەوە و حکوومەتی یابان هێزەکانی خۆی ناکشێنێتەوە تەنها دوای گەڕانەوەی ئارامی نەبێ بۆ عێراق دووپاتی کردەوەو وتی کە ئەم هێزانە یارمەتی گەورە پێشکەش دەکەن بەو ناوچانەی کە تێیدا ماونەتەوە و یابان هاوکاری چالاك دەکات لە بنیاد نانەوەی عێراقدا.

### ٣. چوارچێوەی هەرەمی ڕێك (چیرۆك –STOR):

لەم شیوازەدا هەواڵەکە لە شێوەی چیرۆکدا دەنووسرێتەوە، لە سەرەتادا خوێنەر ئامادە دەکات بۆ بابەتی هەواڵەکە دوایی درێژەی هەواڵەکە ئینجا کۆتاییەکەی. زۆربەی ڕۆژنامەنووسانی ڕۆژئاوا ئەم شێوازە لە باسکردنی ڕووداوی خۆش و سەرسوڕهێنەر و نەوازە یان هەواڵی دڵتەزێن پەسەند دەکەن، ئەویش بۆ ئامادەکردنی خوێنەر بۆ چیرۆکی هەواڵەکە تا دەگاتە ناو قوڵایی ڕووداوەکە.

**پیاوێك کوڕەکەی خۆی دەکوژێت بە هۆی یاری تۆپێنەوە:**

هەندێ جار یارییەکان ئەبێتە هۆی تێکهەڵگژانی نێوان جەماوەری تیپەکان و هەندێ جاریش پێکدادان درێژە دەکێشێ تا دەگاتە ئەوەی پەنا ببرێت بۆ هێزەکانی ئاسایش بۆ چارەسەری کێشەکە، بەڵام کاتێ دەگاتە ڕادەی کوشتن کارێکی نامۆیە.

پیاوێك زیندانیکرا بە هۆی کوشتنی کوڕەکەیەوە لەسەر ئەوەی سوور بووە لە پاڵپشتی کردنی تیپی بەرشەلۆنەی ئیسپانییەوە بە پێچەوانەی باوکی کە هیوای بردنەوەی تیپی ریال مەدرید بوو ڕووداوەکە ئەو کاتە ڕوویدا کە بەرشەلۆنە سەرکەوت بە سەر تیپی ریال مەدرید بە دوو گۆڵ بەرامبەر بە هیچ، باوکەکە کوڕە ١٧ ساڵانەکەی خۆی کوشت بەو چەقۆیەی کە پێش کۆتایی هاتنی یارییەکە ئامادەی کردبوو بۆ قاشکردنی پرتەقاڵ.



هەواڵێك شێوازی چوارچێوەی هەرەمی ڕێك




## بەکارهێنانی شێوازە هونەرییەکانی نووسینی هەواڵ

ڕۆژنامەنووس بۆ نووسینی هەواڵ پشت دەبەستێ بە:

١. ڕووداوێك کە ڕوویداوە وەك (کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەیەك یان ڕوودانی بوومەلەرزە و تەقینەوە).
٢. ڕووداوێك کە خەریکە ڕووبدات وەك (بەستنی کۆنگرە پاش چەند ڕۆژێکی تر یان گەیشتنی کەسایەتییەکی گرنگ و ناودار بۆ وڵات یان کۆبوونەوەیەك کە بۆ دەرکردنی بڕیارێك) دەبەسترێ.
٣. لێدوانی کەسایەتییەکی گرنگ لە کۆمەڵگادا.

**بەکارهێنانی شێوازە تەکنیکییەکانی نووسینی هەواڵ بەم شێوەیە:**

١. چوارچێوەی هەرەمی سەرەوژێرکراو:

بەکاردێت بۆ باسکردنی ڕووداوێك کە ڕووی داوە یان ڕوودەدات.

٢. چوارچێوەی هەرەمی سەرەوژێرکراوی پلەکانە:

بەکاردێت بۆ ئەو لێدوانانەی کە کەسایەتییە گرنگ و گەورەکانی ناو کۆمەڵگا دەیدەن.

٣. چوارچێوەی هەرەمی ڕێك (چیرۆك- Story)

بەکاردێت بۆ داڕشتنەوەی ڕووداوی سەرنجڕاکێش و خۆش و هەندێ جار دڵتەزێن.

## جۆرەکانی ناونیشانی هەواڵ

## Kinds of Headlines

١. ناونیشانی سەرەتایی: ئەو ناونیشانەیە کە ناونیشانەکانی تایبەت بە هەواڵەکە یان بابەتەکەی پێ ئامادە دەکرێ.

٢. ناونیشانی سەرەکی: ئەو ناونیشانەیە کە جەخت لەسەر گرنگترین دێڕی ناو هەواڵەکە یان بابەتەکە دەکات.

٣. ناونیشانی لاوەکی: ئەو ناونیشانەیە دوای ناونیشانی سەرەکی دێت و درێژە بە باسەکە دەدات.

| | |
|---|---|
| سەرەتایی | کاتێك گەیشتە بەغدا |
| سەرەکی | سەرۆك بارزانی دووپاتی بایەخی گفتوگۆ لە پێناو پێکهێنانی حکوومەتی عێراق دەکاتەوە. |
| لاوەکی | جەخت لەسەر بەشداریکردنی عەرەبی سوننە لە حکوومەتدا. |



## چەشنەکانی ناونیشانی هەواڵ

١. ناونیشانی باسکردن (وەسفکردن): وەك (ڕووداوی توندوتیژی لە ئەفغانستان).

٢. ناونیشانی بەراوردکردن: وەك (زیادکردنی باج و بەرزبوونەوەی نرخ).

٣. ناونیشانی پوختە (کورتە): وەك (نزمبوونەوەی ڕێژەی دەرچوون لە ئامادەییە گشتییەکان).

٤. ناونیشانی بڕگەی ناو هەواڵەکە: - وەك (ئارامی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەندە بە چارەسەرکردنی کێشەی فەلەستینەوە).

## چۆنیەتی هەڵبژاردنی ناونیشان

١. ناوێکی دیاری ناو هەواڵەکە (ڕووداو یا کەسێك یا شوێنێك) لەگەڵ تێبینی بەکارهێنانی نازناوی کەسەکە وەك (سەرۆك وەزیران نەخۆشخانەیەکی خێرخوازی دەکاتەوە).

٢. ڕاستی و ژمارە: وەك (لە ناوچوونی ٢٠٠ کەس بە هۆی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەیەکی نەفەر هەڵگر).

٣. ڕووداوەکە خۆی: وەك (ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی میسر بووە هۆی سەرکەوتنی موبارەك).

## پێوەرەکانی دەستپێکردنی ناونیشان

١. سەرەتای ناونیشانەکە کردار بێت (لە ئاکامی پەلاماردانی هێزی پاکستان بۆ کشمیر ١٥ کەس کوژرا)[*].

٢. سەرەتا ناوی کەسێك یا شوێنێك (پایەدارێك یا ناودارێك وەك (هەیفا وەهبی لەگەڵ بازرگانێکی خەڵکی سعودیە ئەڵقە گۆڕینەوەی خۆی ڕاگەیاند).

٣. سەرەتا بە ژمارە وەك (٦ ملیۆن قوتابی بەرەو کورسییەکانی خوێندن بە ڕێکەوتن).

(*) ئەم حاڵەتە زیاتر پەیوەندی بە زمانی عەرەبییەوە هەیە.

## لەبەرچاو گرتنی ئەم پێوەرانە لە کاتی نووسینی هەواڵدا

١. دەبێت ناونیشان مانای هەواڵەکەی تیا بێت و بگونجێت لەگەڵیدا واتە کە هەواڵەکە جیددی بوو نموونەی هەواڵی جەنگ دەبێ لەگەڵ کرۆکی هەواڵەکەدا بگونجێ، بەڵام گەر هەواڵەکە تەنها بۆ سەرگەرمی بوو واتە جیددی نەبوو، دەبێت هەواڵەکە سەرنجڕاکێش بێت.

٢. دەبێت وەڵامی یەکێ لە شەش پرسەکەی تێدا بێت وەکو (کێ، چی، کەی، لە کوێ، بۆچی، چۆن).

٣. گەورە نەکردن و زیادەڕەوی نەکردن لە نووسینی ناونیشاندا لە شێوازی داڕشتن وەکو (ئەی خەڵکینە ئاگاتان لە جیهانگیری بێت).

٤. پشتنەبەستن بە پیاهەڵدانی زیاد لە پێویست وەك (بومەلەرزەیەکی زۆرتوندو وێرانکەر لە ژاپۆن ڕوویدا).

٥. بەکارنەهێنانی دەستەواژەی ئاڵۆز وناڕوون و زاراوەی هونەری و زانستی کە تەنها پسپۆڕانی بواری خۆی نەبێ کەسی تر تێینەگات.

٦. بەکارنەهێنانی نیشانەی سەرسوڕهێنان و پرسیار لە ناونیشانی هەواڵدا وەك (ئایا کازم ساهر هونەرمەند لەتیفە مارە دەکات؟)

٧. نابێت ڕستەی تێهەڵکێش بەکاربهێنین یان بۆشایی نێوان ڕستە وەك (سەرۆکی ئەفغانی — سەرباری بارودۆخی نائارام — بەشداری ئاهەنگەکانی جەژنی نیشتمانی ئەفغانی دەکات).

٨. بەکارهێنانی کورتکراوەی ناوی ڕێکخراوەکان و کۆمپانیاکان، بەڵام لە ناوەڕاستی هەواڵەکەدا ناوی تەواوی ڕێکخراوەکە بهێنرێت وەك (یونسکۆ، یونسێف)

٩. دووبارە نەبوونەوەی وشە لە ناونیشاندا.

١٠. نووسینی هەواڵ بە کاتی ڕانەبردوو نەك ڕابردوو وەك (بۆش چاوی بە شیراك دەکەوێت لە واشنتۆن) نەك (بۆش چاوی بە شیراك کەوت لە واشنتۆن).

١١. ژمارەی کوژراو و بریندار تێکەڵاو نەکرێت باشتر وایە تەنها ناوی کوژراو بنووسرێ.



١٢. بەکارنەهێنانی ئاوەڵناوی داهاتوو (بۆ نموونە گەر هەواڵەکە بە زمانی عەرەبی بنووسرێ ناکرێ (سوف ما بەکاربهێنرێ).

١٣. سەبارەت بە پلەو پایەی ئەو کەسانەی ناویان هاتووە لە هەواڵدا تێبینی ئەم خاڵانە بکرێت:

أ- یەکێکیان دەنووسین ناوەکە یان پلەو پایەکە.

ب- دەتوانرێت هەردووکیان بنووسرێت بە مەرجی ناوەکە پێش پایەکە بکەوێت.

ت- دەبێت نازناوە زانستییەکان بە کورتکراوەی بنووسرێت وەك (دکتۆر =د.).

## چۆنیەتی نووسینی ژمارە لە ناونیشانی هەواڵدا

١. زۆرجار ژمارە بە ڕێنووس دەنووسین نەك بە نووسین.

٢. ئەگەر ژمارەکە یەکێك بوو کەسەکە دەنووسین وەك (کوژرانی عێراقییەك)

٣. ژمارە ٢ بە جووت دەنووسین وەك (مقتل جندیین)(*)

٤. ژمارە ١٠٠ بە نووسین دەنووسرێت.

٥. گەر ژمارەکان لە نێوان سەدان هەزار و ملیۆنەها بوو ئەوا ئەو ژمارەیە بە ڕێنووس دەنووسین وەك (زانکۆی بەغدا ١٥٠ هەزار دینار کۆمەکی بەخشی بە مامۆستاکان.

٦. ملیۆنەها و ملیار بە نووسین دەنووسرێت ئەگەر ژمارەی تەواو بوو وەك (حکوومەتی کوردستان ملیارێك دینار تەرخان دەکات بۆ نۆژەنکردنەوەی قوتابخانەکان).

٧. ژمارە ناتەواوەکان نزیکدەکەینەوە لە ژمارەی تەواو بۆ نموونە (بری ٨٨ — ملیۆن دۆلار نزیك دەکەینەوە لە ٩٠ ملیۆن و بەڵام لە ناو هەواڵەکەدا ژمارە ڕاستییەکەدا دەنووسرێ وەك (هاووڵاتییەك ٨٩ ملیۆن دینار دەدۆزێتەوە لە ناو پاسێکی نەفەر هەڵگردا).

٨. ژمارەکانی خانەی دەیان کە نزیکن لە ژمارەی تەواوەوە کەم و زیاد ناکرێ واتە نزیك ناکرێتەوە.

---

(*) ئەم حاڵەتە پەیوەندی بە زمانی عەرەبییەوە هەیە.وەرگێر)

## دەستپێك

لە هونەری نووسینی ڕۆژنامەنووسیدا ڕاپۆرت گرنگییەكی زۆری هەیە، زۆر لە ڕۆژنامەو گۆڤارەكان لاپەڕەی تایبەتی بۆ تەرخان دەكەن بە مەبەستی گەیاندنی ڕاستییەكان بە خوێنەران. هەواڵ گواستنەوەی ڕووداوە بە كورتی و وەڵامدانەوەی شەش پرسیارەكەیە، بەڵام ڕاپۆرت دەچێتە ناو ناخی ڕووداوەكە و ئەركی خستنەڕووی بیروبۆچوونی جیاواز و بەستنەوەی ڕووداوەكەیە بە پێشینەی مێژووییەوە.

زۆر جیاوازی هەیە لە نێوان (هەواڵ و ڕاپۆرتدا)، بەڵام زۆر لایەنی لێكچوونیشیان هەیە، یەكێ لەو لایەنانە هەردوو هونەرەكە كرۆكیان بریتییە لە ڕووداو و بیروڕا، هەواڵ بە هەنگاوی یەكەمی كاری ڕۆژنامەنووسی دادەنرێت، ڕۆژنامەنووس سەرەتای دەسپێكی كاری ڕۆژنامەنووسی دەبێت بە نووسینی هەواڵ یان ڕاپۆرت دەستپێبكات.

ڕاپۆرت نووسان كێن؟ بێگومان ڕاسپێراو یان پەیامنێرە كە پێویستە خوێنەران ئاگادار بكەنەوە لە هەر ڕووداوێك یان وتەیەك لەگەڵ باسكردنی هەلومەرجی گشتی و پێشینەی ڕووداوەكە یان ئەو هۆیەی كە ئەو لێدوانەی لێكەوتۆتەوە..خوێنەران پێویستیان بە پێناسەی تەواوی باس و بیروڕاو مەسەلەكانەو ڕۆژنامەنووس لە هەواڵدا ناتوانێت بچێتە ناخی ڕووداوەكە و بیروڕا بگەیەنێ، بۆیە لە ڕێگەی نووسینی ڕاپۆرتەوە بایەخی ڕووداوەكە یان لێدوانەكە ڕووندەكاتەوە.

گەر ڕووداوەكە بایەخی هەبوو لای خوێنەران ئەوا ڕۆژنامەنووس تەنها بە گواستنەوەی ڕووداوەكەوە ناوەستێ بەڵكو ڕاپۆرتی لەسەر دەنووسێ و درێژە بە باسەكە دەدات و ئەو بارودۆخەی دەوروبەری ڕووداوەكە و خستنەڕووی زۆر لایەنی پەیوەندیدار بە ڕووداوەكە یان لێدوانەكەوە باس دەكات چونكە بایەخەكەی بە زیاتر باسكردنی دەردەكەوێ، دەتوانین بڵێین كە ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی، تەنها باسێكی دوورو درێژ بەخۆوەناگرێ بەڵكو لە هەمانكاتدا گرنگەو ڕۆژنامەنووس لەو ڕێگایەوە مەبەستی خۆی دەگەیەنێ.



## پێناسەی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی
## Definitions of Report

دەتوانین پێناسەی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی بكەین بەوەی كە: (هونەرێكی ڕۆژنامەنووسییە بۆ خستنەڕووی ڕووداوێك یان لێدوانێك لەگەڵ كۆمەڵێك زانیاری و شیكاری بۆ ڕووداوەكە بە ڕێگەیەكی درێژەپێدراو و بابەتی).

هەروەها پێناسەیەكی تر بۆ ڕاپۆرت:

(ئەو زانیاری و بیروڕایانەیە كە ڕۆژنامەنووس دەیخاتەڕوو لە پێناو شیكارو ڕاڤەكردن و لێكدانەوەی مەسەلەیەكی دیاریكراو).

لە ڕاپۆرتدا ڕۆژنامەنووس بیروڕای خۆی لەسەر مەسەلەكە بە شێوەیەكی بابەتییانە دەخاتە ڕوو، و نابێت لایەنگیری هیچ لایەنێك بكات، بەڵام لە هەواڵدا ڕۆژنامەنووس بیروڕای خۆی باس ناكات لێرەدا جیاوازییەكە ڕوون دەبێتەوە كە هەواڵی ڕۆژنامەنووسی باسی ڕووداوێك دەكات بە شێوەیەكی بابەتی بەبێ ئاماژەكردن بیروڕای خۆی، بەڵام لە ڕاپۆرتدا ڕۆژنامەنووس بیروبۆچوونی خۆی بە شێوەیەكی بابەتی بێلایەنگیری كردنی هیچ لایەنێكی كێشەكان و لەگەڵ نووسینی درێژەی باسەكە ئاماژە پێدەكات.

### جیاوازی نێوان هەواڵ و ڕاپۆرت

| هەواڵی ڕۆژنامەنووسی | ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی |
|---|---|
| ١. ڕۆژنامەنووس بیروڕای خۆی نانووسێت. | ١. ڕۆژنامەنووس بەڕوونی بیروڕاو بیركردنەوەی خۆی دەتوانێت بنووسێت لە پاڵ خستنە ڕووی مەسەلەكەدا. |
| ٢. هەواڵ تەنها باسكردنی ڕووداوەكە دەگوێزێتەوە. | ٢. ڕاپۆرت تێبینی و درێژەی باسەكە دەخاتە ڕوو. |
| ٣. شێوازی نووسینی هەواڵ بریتییە لە ((چوارچێوەی هەرەمی سەرەوژێركراو و چوارچێوەی سەرەوژێركراوی پلەكانە و چوارچێوەی ڕێك چیرۆك)) | ٣. شێوازی نووسینی ڕاپۆرت بریتییە لە (چوارچێوەی هەرەمی سەرەوژێركراو و چواچێوەی هەرەمی ڕێك (چیرۆك یان story) |
| ٤. ژمارەی وشەكانی هەواڵ لە نێوان ٣٠ وشە تا ٩٠ وشەیە | ٤. ژمارەی وشەكانی ڕاپۆرت لە ٢٠٠ وشە تێپەڕ ناكات. |

## تەوەرەكانی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی
## Pivots of Report

١. زانینی ئامانج لە داڕشتنی ڕاپۆرت و سنوورەكەیدا.
٢. كۆكردنەوەی زانیاری بە وردی و بابەتیانە.
٣. گەیشتن بە ئەنجام لە ڕێگەی شیكاری و ئاكامەكانییەوە.
٤. دەستپێكردنی ڕاپۆرت نووسین بە یەكێ لە شێوازە تەكنیكییەكانی نووسینی ڕۆژنامەنووسی.

**ئوسامە ئەنوەر عوكاشە بەردەوامە لە هێرشەكانی**
**بۆ سەر هونەرمەندە حیجاب پۆشەكان**

ئوسامە ئەنوەر عوكاشە سیناریستی بەناوبانگی میسری هێرشەكانی بۆ سەر هونەرمەندە چارشێوپۆشەكان گەیشتە ئەو ڕادەیەی بەوە تاوانباریان بكات كە كاری ئەوان هەڵمەتێكی ڕێكخراوەو ئامانجیان دەستبەسەراگرتنی هونەری میسرییەو، كردنی بە هونەرێك كە كە زمانحاڵی بیرۆكەی سەلەفییەتی توندڕەوە و نەگونجاو لەگەڵ سروشتی ڕێپێدراوی میسرییەكان، هەروەها وتی: خۆ داپۆشینی هونەرمەندانی میسر بە تایبەت هەڵبژاردنی بەناوبانگەكانیان وەك حەنان تورك بەڵگەی ئەوەیە كە هەڵمەتێكی ڕێكخراو و ڕیزبەندكراوە و لە بازنەی دەوڵەمەندە سەلەفییەكانەوە كە خاوەنی سامانن و سوودی تایبەتیان هەیە و بە ڕاگەیاندنەوە بە ڕێوەی دەبەن بۆ دەرخستنی ئەو هونەرمەندانەی كە هەوڵی ڕاكێشانیان دەدەن بۆ خۆ داپۆشین یان ئەوانەی داپۆشراون.
ئوسامە ئەنوەر عوكاشە هەر لەو لێدوانەیدا بۆ كەناڵی عەرەبیە وتی: حیجابكردن یان ئەوانەی حیجابیان كردووە هەروەها لە میانەی قسەكانییدا بۆ (العربیە) وتی نموونەی سینەمای ئێرانی كە حەنان تورك دوای حیجاب كردنی بانگەشەی بۆ دەكات بەڵگەی نەزانی و بێ زانیارییەتی سەبارەت بە سینەمای ئێرانی.



وە هیچ ڕوویەكیش نییە بۆ بەراوردكردن سینەمای ئێرانی و میسری، ئەو جلانەی ئەكتەری ئێرانی لە بەری دەكات جلی نیشتمانی ئێرانییە، بەڵام جلو بەرگی هەندێ لە ئەكتەرەكان لەوانەش حەنان بەرگی نیشتیمانی نییە بەڵكو قسە هەڵبەسراوەكانی سەلەفییەكانە و هیچی تر.
حەنان تورك پاش حیجابكردنی بانگەشەی ئەوەی كرد كە لە مەودوا باشە لاسایی سینەمای ئێرانی بكرێتەوە.
بەڵام ئەم بانگەشەیەی زۆر كەسی لە ناوەندە هونەرییەكاندا تووڕە كردووە.
حەنان دووپاتی دەكاتەوە كە سینەمای ئێرانی بە گشتی هەڵگری مۆركێكی ئایینی نیە چ لە ڕووی بابەتەوە یان ئەوانەی كاری تێدا دەكەن ئەگینا ئەو ناوبانگە جیهانییەی نەدەبوو.
ئەمەو عوكاشە پێشتریش هێرشی كردۆتە سەر هونەرمەندە حیجابەكان لە بەرنامەی (اسهر معانا)ی كەناڵی (نیل للمنوعات)ی میسر ی لەگەڵ بێژەر سەلما شەماع و هونەرمەند عەبیر شەرقاوی.

**ڕاپۆرتی ڕاوبۆچوون (هونەری) بە شێوازی چوارچێوەی هەرەمی سەرەوژێركراوی پلەكانە**

## پێداویستییەكانی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی

١. كۆكردنەوەی زانیاری لە سەرچاوەی سەرەكی خۆیەوە لە ڕێگەی چاوپێكەوتن و بە پشتبەستن بە ئاراستەكردنی پرسیارێك یان دوو پرسیار بۆ هەر لایەنێك.
٢. لێكۆڵینەوە لە دروستی ئەو زانیارییانەی كە ڕۆژنامەنووس دەستی كەوتووە.
٣. ڕۆژنامەنووس لە كۆكردنەوەی زانیاری و ئەنجامدانی چاوپێكەوتن دەبێت خێرا بێت بۆ نووسینی ڕاپۆرت چونكە وەك هەواڵ وایە دەبێت لە كاتی خۆیدا بڵاوبكرێتەوە.
٤. ڕۆژنامەنووس پێویستی بە وێنەیە بۆ پاساوی ڕاستی و دروستی ناوەڕۆكی ڕاپۆرتەكە. ڕۆژنامەنووس دەبێت ئارەزووی وردی و بابەتی تێدابێت بۆ داڕشتنی بابەتەكە بە شێوەیەك كە باس و شیكار بۆ ڕووداوەكە بكات كاتێك كە كارەكە پەیوەندی بە خستنەڕووی باسی ژیانی یەكێ لە كەسایەتییەكانەوە هەبێت.

## دابەشکردنی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی

ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی جۆری زۆرە و دابەش دەبێت بۆ چەند بەشێك یەكەمیان لەسەر بنەمای جوگرافی و دووەمیان لەسەر بنەمای بابەت و سێیەمیان بەگوێرەی جۆرو چوارەمیان لە ڕووی پێكهاتنەوە و بەم شێوەیە:

**١. دابەشكردن لە ڕووی بابەتەوە:**

أ- ڕاپۆرتی ڕامیاری:

ڕاپۆرتی ڕامیاری خستنەڕوو و لێكدانەوە و باسكردنی كاروباری ڕامیاری لەخۆدەگرێ و هەروەها پێشكەشكردنی سەرنجی جیاواز و كەڵەكەبوو سەبارەت بەو مەسەلەیە.

ب- ڕاپۆرتی كێشەو ململانێ:

كاروباری ئاسایشی وەك ململانێ و كێشمەكێش و جەنگەكان و شۆڕشەكان و ڕووداوی تر كە بایەخی هەیە لای خوێنەر لەخۆدەگرێ.

ت- ڕاپۆرتی ئابووری:

لەم جۆرە ڕاپۆرتەدا كاروباری ئابووری و بابەتە ئابوورییەكان دەخرێتە بەر باس و لێكۆڵینەوە كە تەوەرێكی ژیانی ئابووری گەل و نەتەوەكان پێكدەهێنێ و بایەخدارە لای گەلان.

پ- ڕاپۆرتی كۆمەڵایەتی:

ئەو كاروبارە كۆمەڵایەتیانە لەخۆدەگرێ كە بایەخی هەیە لای كۆمەڵگا وەك مەسەلەی ژنهێنان و شووكردن و ئاشكراكردنی ڕووی نیگەتیف و پۆزەتیڤی (سلبی و ایجابی) مەسەلە كۆمەڵایەتییەكان لەناو كۆمەڵگادا.

ج- ڕاپۆرتی ڕۆشنبیری:

ئەم جۆرە ڕاپۆرتانە بایەخ بە مەسەلە ڕۆشنبیرییەكان دەدا و بە باسكردنی درێژ و شیكردنەوەی وەك خول و كۆنگرە و ڤیستیڤاڵی ڕۆشنبیری.

ح- ڕاپۆرتی زانستی:



لەم جۆرە ڕاپۆرتەدا ڕووداوە زانستییەكان باسدەكرێت كە هەندێكیان پێویستیان بە لێكدانەوە و شیكردنەوەی قووڵە وەك نووسینی ڕاپۆرتێك سەبارەت بە دۆزینەوەی ئەستێرەیەكی نوێ بە ڕێكەوت لە كۆمەڵەی خۆر.

خ- ڕاپۆرتی هونەری:

كاروبارو ڕووداوی هونەری لەخۆدەگرێ وەك ڤیستیڤاڵی سینەمایی و گۆرانی و فیلم و وێنە، كە هەواڵی ڕۆژنامەنووسی ناتوانێ هەموو لایەنێكی ئەم چالاكیانە بخاتەڕوو بۆیە پێویستی بە ڕاپۆرت نووسین هەیە.

د- ڕاپۆرتی وەرزشی:

ئەم جۆرە ڕاپۆرتە بایەخ دەدات بە یارییە گرنگەكان یاخود پاڵەوانێتی وەرزشی یان ڤیستیڤاڵی فوتبۆڵ و (تۆپێن) یان ڕووداوی وەرزشی و لێدوانی تایبەت بە كاروباری وەرزشی. بە ئاماژەكردن بە هەموولایەنێك، گەر هەواڵ بێت تەنها ڕەوشی ڕووداوەكە بە سادەیی باس دەكات و وەڵامی شەش پرسیارەكەی تێدایە لەگەڵ چەند باسێكی تر، بەڵام ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی ڕەوشی ڕووداوە وەرزشییەكە بە درێژی باس دەكات بە هاوكاری بیروڕای هەندێ لە وەرزشوانان یان پەلەكانی وەرزش.

**٢. دابەشكردنی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی لە ڕووی جوگرافییەوە:**

أ- ڕاپۆرتی ناوخۆیی:

ئەو ڕاپۆرتەیە كە ڕووداوێك یان لێدوانێك یان وەسفی شوێنێك یان پیشاندانی كەسایەتییەكی ناوخۆی بە هەمەچەشن دەخاتەڕوو جا ڕامیاری بێت یان ئابووری یان ڕۆشنبیری یان هونەری یاخود وەرزشی، و زۆرجار ڕۆژنامەكان بایەخ بەم ڕاپۆرتانە دەدەن چونكە بابەتی ناوخۆیی بە پلەی یەكەم بایەخی خۆی هەیە لە نووسینی ڕاپۆرتدا.

ب- ڕاپۆرتی هەرێمایەتی:

ڕۆژنامەنووس لە ڕاپۆرتەدا ڕووداوێکی هەرێمایەتی دەخاتەڕوو کە ڕۆژنامەکە لە وڵاتێکی ئەو هەرێمەدا دەردەچێ وەك ئێران، سعودیە کە هەرێمایەتین سەبارەت بە عێراق.

ت- ڕاپۆرتی نێودەوڵەتی:

لەم ڕاپۆرتەدا ڕووداو و لێدوانی نێودەوڵەتی باس دەکرێت زۆر جار وڵاتانی جیهان بە گشتی بایەخی پێدەدەن.

**٣. دابەشکردنی ڕاپۆرت لە ڕووی جۆرەوە:**

أ- ڕاپۆرتی سەرنج:

ئەو ڕاپۆرتەیە کە تەنها سەرنجی بەرپرسان دەخاتەڕوو و ڕۆژنامەنووسیش کۆمەڵێك بیروڕای جیاواز دەخاتەڕوو بە شێوەیەکی بابەتی و بە بێ لایەنگیریکردنی هیچ کام لەو بیروڕایانە.

ب- ڕاپۆرتە هەواڵ:

ئەو ڕاپۆرتەیە کە ڕۆژنامەنووس بە پلەی یەکەم ڕەوشی ڕووداوێك بە لێکدانەوەوە دەخاتەڕوو وە بە پلەی دووەم بیروڕا، ناونانی ئەم ڕاپۆرتە لەوەوە هاتووە کە سەرەتا بە هەواڵێك دەستپێدەکات و دواتریش درێژەی باسەکە بە شیکردنەوە و ڕاڤەکردنەوە و لێکدانەوەوە وە پێشینەی زانیارییەکان دەخاتەڕوو سەبارەت بەو هەلومەرجەی ڕووداوەکە.

ت- ڕاپۆرتی وەسفکار (پیاهەڵدان):

بریتییە لە باسکردنی هەلومەرجی ڕووداوو تۆمارکردنی تێبینییە گرنگەکان لە پێناو باسکردنی ڕووداوەکە بۆ خوێنەر و خستنەڕووی وێنەیەك لە ڕووداوەکە، وەك ڕاپۆرت لە بارەی هەڵبژاردن و بەشداریکردنی هاووڵاتیان لە سندووقەکانی پاڵاوتندا.

پ- ڕاپۆرتی پیشاندانی کەسایەتییەکان:



ڕۆژنامەنووس لەم جۆرە ڕاپۆرتەدا کەسایەتییەك هەڵدەسەنگێنێ و وەسفی دەکا لە پێناو ناسینی بە خوێنەر، بۆ نموونە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان ڕوودەکەنە بڵاوکردنەوەی ئەمجۆرە ڕاپۆرتانە دوای سەرکەوتنی یەکێ لە پاڵێوراوان لە هەڵبژاردنە سەرۆکایەتیەکان بە تایبەت گەر ناسراو نەبێت.

## شێوازە تەکنیکییەکانی نووسینی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی

١. شێوازی چوارچێوەی هەرەمی سەرەوژێرکراو:

زۆربەی ڕۆژنامەنووسان پشت دەبەستن بەم شێوازە بۆ نووسینی ڕاپۆرتە هەواڵ کە ناوەڕۆکەکەی بریتییە لە زانیاری و بیروڕا وە چوارچێوەکەش دابەشدەبێت بە سەر پێشەکی کە گرنگترین زانیاری تێدایە یان گرنگترین لێدوانی بەرپرسان یان کەسێکی ناودار بێجگە لە کرۆك و کۆتای ڕاپۆرتەکە.

- پێشەکی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی:

پێشەکی ڕاپۆرت لەم شێوازەدا ئەمانە لە خۆ دەگرێ:

١. **گرنگترین زانیاری لە ڕاپۆرتەکەدا.**

٢. **گرنگترین لێدوان لە ڕاپۆرتەکەدا.**



- **سیفاتەکانی پێشەکی:**

١. وەڵامی شەش پرسیارەکە یان زۆربەیان لەخۆبگرێ.
٢. دیارترین ڕووداو یان لێدوان لەخۆبگرێ.
٣. پێشەکی بەشێوەیەکی سەرنجڕاکیش بنووسرێ.

- **کرۆکی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی:**

لەم شێوازەدا (چوارچێوەی هەرەمی سەرەوژێرکراو) کرۆك زانیاری گرنگ لەسەر ڕووداوەکان لەخۆدەگرێت، ڕۆژنامەنووس بۆ گەواهیدان لێدوانی کەسێك لە کەسایەتییەکان لە گەڵ بابەتەکەدا باس دەکات لەگەڵ پیشاندانی ئەو ژمارە ودەرخستانەی کە لە بەردەستدان هەروەها دەرخستنی بیروڕا.

وەك:

١. خستنەڕووی ئەو بیروڕایانەی کە لایەنگیری مەسەلەکە دەکات.
٢. خستنەڕووی ئەو بیروڕایانەی کە بێلایەنن.
٣. خستنەڕووی ئەو بیروڕایانەی کە دژی مەسەلەکەن.
٤. خستنەڕووی ئەو بیروڕایانەی کە گۆشەنیگای لێکۆڵەرەوانە لەسەر مەسەلەکە.

- **کۆتایی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی:**

ڕۆژنامەنووس لە نووسینی برگەکانی کۆتایی ڕاپۆرتەکەدا ئەو ئەنجامانە دەخاتەڕوو کە لە میانەی نووسینی پێشەکی و کرۆکی هەواڵەکەدا دەستی کەوتووە و بەرچاوترین ئەگەرەکانیش کە پەیوەستن بە باسەکە.



٣. شێوازی چوارچێوەی هەرەمی ڕێك (چیرۆك — story):

نووسینی ڕاپۆرت بەم شێوازە لە پێناو بەخشینی زانیارییە لە پێشەکی ڕاپۆرتەکەدا و خۆ ئامادەکردن بۆ زانیاری گرنگتر لەم شێوازە هونەرییەدا ڕاپۆرت پێکدێت لە پێشەکی و کرۆك و کۆتایی.

**سەرۆکی هەرێمی کوردستان: هیچتان بۆ نامێنێتەوە پەشیمانی نەبێ**

پاش بڕیارەکەی هەفتەی ڕابردووی سەرۆکی هەرێمی کوردستان سەبارەت داگرتنی ئاڵای عێراق لە هەرێمی کوردستان، ئاڵۆزی لە نێوان بەغداد و هەولێر زیادی کرد، نوری مالکی سەرۆك وەزیرانی عێراق دووپاتی کردووە کە ئاڵای عێراق تەنها ئاڵایەکە دەبێ لەسەر هەموو بستێکی ئەم وڵاتە هەڵبکرێ.

سەرۆك بارزانیش وەڵامیدایەوە کە هەڕەشەکردن ڕەتدەکەینەوە.

هەروەها لە ڕاگەیاندنێکی نووسینگەی مالیکیدا هاتووە کە ئاڵای ئێستای عێراق تاکە ئاڵایە کە پێویستە بەرز بکرێتەوە لەسەر هەموو بستە خاکێکی عێراق هەروەها لە ڕاگەیاندنەکەدا هاتووە کە دەبێ بەم جۆرە کار بکرێ تا ئەو کاتەی کە ئەنجوومەنی نوێنەران بە پێی دەستوور بڕیارێك لەو بارەیەوە دەردەکەن.

لە لایەکی ترەوە سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە وتەکەیدا لە دانیشتنی کردنەوەی خولی دووەمی پەرلەمانی کوردستان داکۆکی کرد لە بڕیاری داگرتنی ئاڵای عێراق لە کوردستان هەروەها لە ئاخافتنەکەیدا وتی:

کە پەرلەمانی کوردستان بڕیاری داوە کە کوردستان لە چوارچێوەی فیدرالیدا دەبێت و هەر کاتێکیش پەرلەمان بینی کە بەرژەوەندی کوردستان لە سەربەخۆییدایە ئەوا بێئەوەی لە کەس بترسین ڕایدەگەیەنین هەروەها سەرۆکی هەرێمی کوردستان هێرشی کردە سەر هەندێ لە سیاسەتمەدارانی عێراقی و وتی: کار گەیشتۆتە ئەوەی کە هەندێ کەس هەڕەشەمان لێبکەن و دەڵێن دەستمان شکاوە و کاتێك بگەڕێتەوە ئەوەی بە خۆشی وەرگیراوە، بە دەستی دەهێنینەوە ئێمەش دەڵێین: نەخێر دەستتان نەشکاوە بەڵکو ساغەو دەیان دەست یارمەتیدەرێتی و لە ئەنجامیشدا هیچتان بۆ نامێنێتەوە پەشیمانی نەبێت و

زەمەنی هەڕەشەش کۆتایی هاتووە هەروەها وتی: ڕاوێژمان لەگەڵ سەرۆك کۆماری عێراق جەلال تالەبانی و سەرۆك وەزیرانی عێراق نوری مالکی کردووە و وتوومانە کە ئێمە ئاڵای چواردەی تەمموز هەڵئەکەین هەتا ئەو کاتەی کە ئاڵایەکی نوێ دادەنرێت.
مێژووی ئەو ئاڵایەی ئێستای عێراق کە پێکهاتووە لە چوار ڕەنگ سپی ڕەش سوور و بە سێ ئەستێرەی سەوز ڕازێنراوەتەوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی **١٩٦٣** کاتێك کە حزبی بەعس کورسی دەسەڵاتی گرتە دەست پاش لە ناوبردنی حکومەتەکەی عەبدولکەریم قاسم وە دەستەواژەی الله اکبر بە دەستخەتی سەرۆکی لابراو صدام حسین بۆی زیادکرا پێش هەڵگیرسانی شەڕی کەنداوی دووەم ساڵی ١٩٩١.

ڕاپۆرتێکی ڕامیاری بەشێوازی چوارچێوەی هەرەمی ڕێك (چیرۆك) نووسراوە

**أ- پێشەکی (لید) ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی:**

پێشەکی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی لەم شێوازە نووسینەدا بریتییە لە دەروازەیەك بۆ چوونە ناو بابەتەکە، دەبێت دەستەواژەی پێشەکی بابەتەکە بە بایەخێکی ژیرانەوە بنووسرێت ئیدی ئەو ڕاپۆرتە ڕامیاری بێت یان ئابووری یان ڕۆشنبیری یاخود هونەری و وەرزشی.

فەرمانەکانی پێشەکی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی:

١. سەرەتایەك بۆ بابەتەکە.
٢. ئامادەکردنی خوێنەر بۆ بابەتی ناو ڕاپۆرتەکە و پێشکەشکردنی کورتەیەك لە بابەتەکە.
٣. باسی ڕەوشی ڕووداوێك یان وەسفی کەسێك لەخۆبگرێ.

**توخمەکانی پێشەکی:**

١. ڕووداوێك.
٢. هەڵوێستێکی دیاریکراو.
٣. تابلۆیەکی لۆژیکی.
٤. بیرۆکەیەکی نوێ بۆ بابەتێکی کۆن.



٥. لێدوانێکی گرنگ.




**سیفەتەکانی پێشەکی ڕاپۆرت:**

١. توانستی بە ئاگا هێنانەوەی خوێنەر.
٢. توانستی ڕاکێشکردنی خوێنەر بۆ بەردەوامبوون لە خوێندنەوەی بابەتەکە تا کۆتاییەکەی.

**ب – کرۆکی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی:**

ڕاپۆرتنووس لە ڕاپۆرتەکەیدا درێژە بە باسەکەی دەدات بە خستنەڕووی گەواهی و بەڵگەنامەکان باوەڕ بە خوێنەر دەهێنێ و بە ئاگایان دەهێنێتەوە لە ئاکامەکان، کرۆکی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی دوو لایەنی گرنگی هەیە وەك:

١) ڕەوتی ئەو ڕووداوەی کە لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووەو ئەو ڕووداوانەی بە دوایی یەکدا هاتوون، لە سەرهەڵدانی ڕووداوەکە وە تا کۆتایی.
٢) بەیەکەوە بەستنی ڕووداوەکە و ئاشکراکردنی پەیوەندییەکان و لابردنی ئاڵۆزی ئەنجامەکان لەسەر دەستێوەردانەکانی.

**ت- کۆتایی ڕاپۆرت:**

ڕاپۆرتنووس لە بڕگەی کۆتایی ڕاپۆرتەکەیدا ئەو دەرەنجامە ئاشکرا دەکات کە پێیگەیشتووە هەروەها ئەو ڕاستییەی کە هەڵوەستەی لەسەر کردووە.کە بێگومان ئەم خاڵانە دەگرێتەخۆ:.

١) هەڵسەنگاندنی بابەتەکە لە لایەن نووسەرەوە.

٢) خستنەڕووی دەرەنجامی بابەتی ناو ڕاپۆرتەکە.

ڕاپۆرتنووس پێویستە ڕەچاوی دوو خاڵی گرنگ بکات لە کاتی نووسینی کۆتایی ڕاپۆرتدا کە ئەویش:

أ- بە پێی توانا سووربێت لەسەر وروژاندنی پرسیار لە هۆشی خوێنەردا لە بارەی بابەتی ڕاپۆرتەکە.

ب- کۆتایی ڕاپۆرتەکە شوێن خۆی لە بیرکردنەوەی خوێنەر جێ بهێڵێ، بە جۆرێك خوێنەر بتوانێ ڕای خۆی سەبارەت بە بابەتی ڕاپۆرتەکەدا، دروست بکات.

دووخاڵی گرنگ هەیە پێویستە لە لایەن ڕاپۆرتنووسەوە ڕەچاو بکرێ:

١) دەبێ وریابێ لەوەی درێژەی بێ مانا بە ڕاپۆرتەکە نەدات.

٢) وریابێ لەوەی ناکۆکی دروست تەبێ لە نێوان ئەو زانیارییانەی کە لە پێشەکی ڕاپۆرتەکەدا هاتووە و ئەوانەی لە کرۆك و ئەنجامی کۆتاییدا خراوەتەڕوو.

دەڵێ: گریاوم ئەو کاتەی هێرش کرایە سەر زەیدان

ئیزابێل ئەدەژانی لە ڕۆڵی شاژن ماری ستێوارت لەسەر شانۆ

پاریس / الشرق الاوسط

لەم وەرزە نوێیەی پاییزدا، لە بەر چاوترین ڕووداوی شانۆییە....ئەوەتا لە ئێوارەی هەینی داهاتووەوە ئەکتەری فەرەنسی ئیزابێل ئەدەژانی لەسەر سەکۆی شانۆی مارینی ڕۆڵی پاڵەوانێتی دەبینێ لە شانۆگەری (دوا وشەی ماری ستێوارت) کەلە دانانی نووسەری ئەڵمانی ولفگانگ هیلدیشمیر و دەرهێنانی دیدیە لونگ.



ئەم ڕۆڵە نیشانەیەکی نوێ دەخاتە سەر ڕەوتی ئەکتەری لە دایکبوو لە باوکێکی جەزائیری پاش ئەوەی لێهاتووانە ڕۆڵی مێژوویی نواند لەسەر شاشەو شانۆ وەك (شاژن مارگۆ و کامی و کلۆدیل و ئاوندین و ئەدیل هۆگۆ).

شانۆگەرییەکە باسی ڕووداوی دوو کاتژمێری کۆتایی ژیانی ماری ستێوارتی شاژنی فەرەنساو ئوسکوتلەندە دەکا کە لە سەدەی شانزەدا ژیاوە و شووی کردووە بە سێ پیاو لە نێوانیاندا پادشا هنری دووەم، پێش لە سێدارەدانی بە بڕیاری کوڕی مامی ئەلیزابێت و، بەڕێوەبەرێتی شانۆکە ڕایگەیاند کە زیاتر لە سەد هەزار بلێت فرۆشراوە پێش کردنەوەی شانۆگەرییەکە.

لە لێدوانێکی ڕۆژنامەنووسیدا ئەدەژانی وتی: شاژنی لابراو تووشی هەموو جۆرە ئیرەیی و پڕوپاگەندە و پیلان بۆتەوەو کە پێش ساتی لە ناو چوونی لە ناخەوە کووشتوویەتی، لە وەڵامی پرسیارێك سەبارەت بە بەراوردکردن لە نێوان ئەوەی تووشی ماری ستێوارت هاتووە دەڵێ کە خەڵکی ژیانێکی تری بۆ دروستکردووە بێجگە لەو ژیانەی کە تیایدا ژیاوە و ئەوەیشی کە ئەکتەرەکە تووش دەبێت لە پڕوپاگەندەو قسەو قسەڵۆك.

ئەدەژانی وتی جاران خەڵك کاتیان بەسەردەبرد بە گوێگرتن و وەڵامدانەوەی پڕوپاگەندەکان، بەڵام ئێستا زوو بیریان دەچێت و لە کارێکی تر دەگەڕێن. هەروەها وتی: ئەکتەری سەرەتای دەستپێکی کاری دەبێ ژیانی خۆی لە گەڵ پڕوپاگەندەکان ڕێکبخات یان بە دوای پیشەیەکی تردا بگەڕێت.

سەبارەت بە تاوانبارکردنی یاریزانی تۆپی پێ زەینەدین زەیدان پاش کە لەوەشاندنەکەی، ئەدەجانی لە بەرگریی کردنی لە هاوولاتیانی خۆی وتی: من لە فڕۆکەخانەی لەندەن بووم کاتێ ئەو ڕووداوە ڕوویدا هەموو ڕۆژنامە ئینگلیزییەکانم کڕی و خوێندمەوە فرمێسك بە چاومدا هاتە خوارەوە بە هۆی توندی هێرشەکە وامزانی شەڕی سەد ساڵەیە و کۆتایی نەهاتووە، بەڵام زەیدان خاوەنی جوامێرییەکی ڕاستەقینەیە هەرچییەکی کردبێ مەبەستی ئازاردان نەبووە ئەگینا زرمەکەی لە سەری دەدا تەنها ویستوویەتی تووڕەبوونی خۆی هەڵڕێژێ لە ئەنجامی ئەو جنێودانەی ئاراستەی کرابوو ئاماژەییەدا کە بووە قوربانی.

ڕاپۆرتە هەواڵ بە شێوازی چوارچێوەی هەرەمی ڕێك (ستۆر)

٣. شێوازی چوارچێوەی هەرەمی سەرەوژێرکراوی پلەکانە:

ئەم شێوازە نووسینە لە راپۆرتی رۆژنامەنووسیدا لێدوانەکانی کەسایەتییە سیاسی و هونەری و وەرزشی و کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵ لەخۆدەگری.

چوارچێوەکە پێکدێت لە پێشەکییەك کە رۆژنامەنووس گرنگترین لێدوانی کەسایەتیەك یان کۆمەڵە کەسانێك دەخاتەڕوو، کرۆکی راپۆرتەکە لە گرنگترینەوە بۆ کەمترین گرنگی لێدوانە نووسرێت و لە کۆتایی راپۆرتەکەشدا رۆژنامەنووس رای دەخاتەڕوو لەسەر بنەمای بەدواداچوون و لێدوانەکان.

ئەم شێوازە هەواڵێك لەخۆدەگرێ بە لە بەرچاوگرتنی ریزبەندی شەش پرسیارەکە.

پێکهاتووە لە سێ بەش:

أ- پێشەکی

باس لەگرنگترین لێدوان دەکات کەلە راپۆرتەکەدا هاتووە.

ب- کرۆك

لە گرنگترین لێدوانەوە بۆ کەمترین لێدوانی گرنگ دادەنرێت.

ت- کۆتایی

راوبۆچوونی رۆژنامەنووس دەخرێتەڕوو لەسەر ئەو بۆچوونانە کە لە بەدواداچوونەکەدا هاتووە.

پێشەکی

کرۆك

کۆتایی



## جۆرەکانی راپۆرتی رۆژنامەنووسی

**١. راپۆرتی راو سەرنج:**

ئەمجۆرە راپۆرتە پشت بە ئەو سەرنج و راو بۆچوونانە دەبەستێ کە بەرپرسان و کەسایەتییەکان لە بواری رامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریدا رایدەگەیەنن زۆر جار ئەو سەرنج و بیروڕایانە لەگەڵ شیکردنەوەی زۆر لایەندا دەخرێتەڕوو لە وانە:

أ- راوبۆچوونی دژ بەو باسەی خراوەتەڕوو.

ب- راوبۆچوونی بێلایەن لەو باسەی کە خراوەتەڕوو.

ت- راوبۆچوونی لایەنگیری ئەو باسەی کە خراوەتەڕوو.

ئەم جۆرە راپۆرتانە وەك (گواستنەوەی بەڕێوەچوونی کۆنگرەی رۆژنامەنووسی و ڤیستیڤاڵی هەڵبەست (شیعر) و رۆشنبیری بە راپۆرتە راوسەرنج دەژمێردرێت. رۆژنامەنووس بێجگە لە گواستنەوەی رووداوەکە زۆربەی جار شیکاریش دەخاتە روو بۆ ئەو باسەی کە سەرنج و بیروبۆچوونی لەسەر وەرگیراوە.

**٢. راپۆرتە هەواڵ:**

ئەو راپۆرتەیە کە بایەخ دەدا بە راڤەو شیکار و شرۆڤە و لێکدانەوەی رووداوە رۆژانەیی و هەنووکەییەکان سەرەڕای خستنەڕووی قوڵترین وتە کە ناودارەکان دەیبێژن وەك هونەرمەندان و سیاسەتمەداران و ئەدیبان و نووسەران و ئابووریناسان سەبارەت بە رووداوەکە وەکو کۆنگرەی رۆژنامەنووسی کە دەبەسترێ سەبارەت بە رووداوە جۆراوجۆرەکان.

هەواڵی رۆژنامەنووسی لە راپۆرتە هەواڵ جیادەکرێتەوە بەوەی هەواڵ بریتییە لە وەسفکردنی رووداوێك یان گواستنەوەی لێدوانێك بە شێوەیەکی کورت.

بەڵام راپۆرتە هەواڵ بریتییە لە وەسفکردن و راڤە و شیکاری رووداوێك یان چەند رووداوێکی بە یەکەوە گرێدراو، یان خستنەڕوو شیکار و راڤە بۆ لێدوانی ئەو کەسایەتیانەی ناو کۆمەڵگادا رۆڵیان هەیە یان لێدوانی کۆنگرەکان.

**فەرمانەکانی ڕاپۆرتە هەواڵ:**

١. پێشکەشکردنی دەرخستە و ئامار یان زانیاری و درێژە باسکردنی ڕووداوێك یان ڕووداوە بە یەکەوە گرێدراوەکان کە تەنها بە هەواڵی ڕۆژنامەنووسی ناتوانرێ بخرێتەڕوو.
٢. دەرخستنی چەند لایەنی نوێ لەسەر ڕووداوێکی بایەخدار.
٣. پێشکەشکردنی پێشینەیەکی مێژوویی لەسەر ڕووداوێك.
٤. پێشکەشکردنی هەڵسەنگاندنێکی بابەتی لەسەر ئەو دەرخستانەی کە لە ڕێگەی بنەما و دەرئەنجامەکان و ئەو ڕاوبۆچوونانەی کە ڕاپۆرتنووس بۆی دەرکەتووە.

ڕووخسارەکانی (ڕواڵەتی) ڕاپۆرتە هەواڵ:

* پابەند بوون بە بابەتێتی و بێلایەنی لە کاتی گێڕانەوەی زانیارییەکاندا یان گواستنەوەی وتە و لێدوانەکان.
* پێویستە ڕاپۆرتە هەواڵ لە پاڵ زانیاری و دەرخستە نوێییەکاندا بایەخ بە پێشینەی مێژوویی یان بەڵگەیی بدات.
* دەبێ زانیاری و گۆشەنیگای کەسایەتییە جیاوازەکان لە یەکتر جیابکاتەوە.

بەیرووت: پرسەکان لەسەر ئامادەبوونی نەسروڵا لە ئاهەنگی (النصر الالهی)

لوبنان هەڕەشەی پەنا بردنە بەر ئەنجوومەنی ئاسایش دەکا گەر ئیسرائیل نەکشێتەوە

بەیرووت / سائر عەباس

ئەمڕۆ لوبنانییەکان چاودێری سەرۆکی حزب الله (حەسەن نەسروڵا) دەکەن کە ئایا لە ئاهەنگی (النصر الالهی) دا دەردەکەوێ کە پارتەکەیان ڕێکی دەخات و هیوای وایە کە گەورەترین ئاهەنگ بێت لە مێژووی لوبناندا، کە ئەمەش یەکەم دەرکەوتنی نەسروڵایە لە هەڵگیرساندنی شەڕەوە لە ١٢ی تەمووزی ڕابردووەوە، چونکە ئیسرائیل ڕایگەیاندنووە ئەو ئامانجیان دەبێت.

هەندێ لە ناوەندەکانی لوبنان باسی ئەوەیان کردووە کە پارتەکەیان لە چەند لایەنێکی



عەرەبییەوە زامنی ئەوە کراوە کە ئیسرائیل ئەو کۆبوونەوەیە نەکاتە ئامانجی خۆی.

لێپرسراوانی پارتەکەش ڕەتی قسەکردنیان کردووە لەسەر ئەگەری ئامادە بوونی نەسروڵا بۆ ئەو ڤیستیڤاڵە بەو باوەڕەی کە ئەوە لە گرتنە بەری ڕێوشوێنی ئەمنیەوەیە لەگەڵ ئەوەی هەندێ لە سەرچاوە لە پارتەکەدا لەسەر ئەوە بوون کە نەسروڵا وتار پێشکەش دەکات، بەڵام دیار نییە کە ئایا بە ڕاستەخۆ یان تۆمارکراوە.

ئەو مەیدانەی کە بۆ ئاهەنگەکە ئامادەکراوە شاشەی گەورە گەورەی بۆ دابینکراوە بۆ گواستنەوەی وێنەکان بۆ ئامادەبووان.

حسین رەحال وتەبێژ بە ناوی حزب الله بۆ شرق الاوسط دوێنی دواو گووتی:

کە وتاری حزب دەبێتە سەرەتای قۆناغێکی نوێ لە کاری ڕامیاری حزبدا و پوختەی ئەو پەندو هەڵوێستانەی کە لە میانەیدا لوبنانییەکان ئازاد و سەربەسبوون بووە بە هۆی کردنەوەی دەروازە بۆ قۆناغی داهاتوو. هەروەها وتی هەرگیز وەك پێش ١٢ی تەمووز نابێت بە هەموو هەڵسوکەوتەکانییەوە، و سووربوو لەسەر ئەوەی کە ڕێگە پاککردنەوەیەکە بۆ قۆناغێکی نوێ و مێژووی جیاکراوە. لەو ناوەندەدا حزب الله بەردەوام بوو لە کۆبوونەوەی جەماوەری کەم وێنە بۆ بەشداریکردنی ڤیستیڤاڵ کە بریتییە لە پیشاندانی هێزی میللی و ڕامیارییەوە و لایەنگرانی حزب بە بێ پشوو کار دەکەن بۆ دابینکردنی لایەنی لۆژیکی ئەو پاسانەی کە هەموو لایەنگران دەگەیەنێتە لە هەموو ناوچە جیاوازەکان و دابینکردنی گەیاندن و ئامادەبوونیان بۆ شوێنی ئاهەنگەکە کە زیاتر لە شەش هەزار کەس کاردەکەن بۆ ئامادەکردنی هەروەها زانیاری وا بڵاوبۆتەوە کە سەدان لە لایەنگرانی ئەو حزبە لە دەرەوەی لوبنان ئامادە دەبن بۆ بەشداریکردنی و گەڕانەوە لە هەمان ڕۆژدا، و ئامادەباشی و ئاگاداری لە ناوچە جیاوازەکانی باشووردا بەردەوامە بۆ بەشداریکردن.

لە ئیسرائیلیش سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل دوێنی بۆ وەڵامی پرسیارێك سەبارەت بە وەی کە ئایا ئیسرائیل هەوڵی کوشتنی ئەمینداری گشتی حزب (الله)ی لوبنانی نەسروڵا دەدات ئەگەر بەشداری ڕەوتی نەسر لە بەشی بەیرووتی خواروو پێگەی حزب بکات، و

بۆ وەڵامی پرسیاری کەناڵی ١٠ی تەلەفزیونی ئیسرائیل کە ئایا نەسروڵا ئامانجە گەر دەرکەوێت لەو رووداوەی ڕۆژی هەینی ئۆلمەرت گووتی: بڕوات وایە گەر وابێت ئاگادارت بکەم و پێت بڵێم.
هەر لە وێدا ئەمیل لەحود سەرۆك وەزیرانی لوبنان بانگەشەی کۆمەڵەی نێودەوڵەتی کرد بۆ پاراستنی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش ی ژمارە ١٧٠١ لە کەوتن و لە بڕیارەکانی تری پەیوەندیدار بە قەیرانی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە ئەویش بۆ پاراستنی ئاشتی لەم ناوچەیە و جیهاندا.
لە کاتی پێشکەشکردنی ئەو وتەیەی لە بەردەم کۆمەڵەی گشتی نەتەوەیەکگرتووەکاندا لە خوولی ٦١ میندا پرسیاری کرد کە (ڕاستگۆیی نەتەوە یەکگرتووەکان کوانێ لەو کاتەی کە دواکەوتنی بڕیاری ١٧٠١ زەرەرمەند بوو) وە توانای ڕاستەقینەی ئەم ڕێکخراوە چییە بۆ پارێزگاری کردنی ئاسایش و ئاشتی جیهانی کاتێك کە بڕیارەکانی لە ژێر ڕکێفی بەرژەوەندی دەوڵەتە گەورەکاندا بێت؟). لە لایەکی ترەوە شەوی ڕابردوو لوبنان ڕایگەیاند کە پەنا دەبەنە بەر ئەنجوومەنی ئاسایش گەر ئیسرائیل کشانەوەی خۆی تەواو نەکات.

### ٣. ڕاپۆرتی وەسفکار باسکردن یان پیاهەڵدان:

ئەو ڕاپۆرتەیەکە بە دوای دەستنیشانکردن (وێنەگرتن) و وەسفکردنی رووداوەکاندا دەڕوات. مانای زیاتر بایەخ بە وێنەی رووداوەکە و وەسفکردنی دەدا نەك ڕاڤە و شیکاری، لە کاتێکدا کە نووسەری ڕاپۆرتە هەواڵ بایەخ دەدا بە گێڕانەوەی دەرخستەو زانیارییەکان کە پەیوەستن بە رووداوەکانەوە، بەڵام ڕاپۆرتی وەسفی بایەخ دەدا بە خستنەڕووی پێشینەکان بە شێوەیەکی بابەتیانە بەبێلایەنی لە پێناو دەستنیشانکردنی رووداوەکان ئەمجۆرە ڕاپۆرتە ئەمانە لە خۆدەگرێ خستنە ڕووی هەواڵی جەنگ و هەڵبژاردنەکان یان نواندنی سەربازی یان یاری وەرزشی یاخود ئاهەنگی هونەری یان ئاهەنگە نیشتمانی و نەتەوەییەکان.



**فەرمانەکانی ڕاپۆرتی وەسفکار:**

أ- باسکردنی رووداوەکە و ئەو هەلومەرجەی دەوروبەری.
ب- خستنەڕوو و وێنەگرتن و تۆمارکردنی ئەزموونی خۆی لەگەڵ رووداوەکەدا.
ت- بە شێوەیەکی وابنووسرێت خوێنەر پاش خوێندنەوەی ڕاپۆرتەکە وا هەست بکات خۆی رووداوەکەی بینیوە.

### ٤. ڕاپۆرتی نیشاندانی کەسایەتی:

ئەو ڕاپۆرتەیە کە بایەخ دەدا بە پیشاندانی ئەو کەسایەتیانەی کە پەیوەندییان هەیە بە رووداوەکەوە و ڕۆڵی دیاریان هەیە لەناو کۆمەڵگای ناوخۆیی یان هەرێمایەتی یاخود نێودەوڵەتی، بە شێوەیەك کە ڕاپۆرتەکە شیکاری بیرکردنەوەو ئاراستەی بیروڕایەکانی بکات. زۆربەی جار ئەم ڕاپۆرتانە بۆ وەسفکردنی ئەو کەسایەتیانە بەکاردێت کە لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی یان پەرلەمانی لە وڵاتێکدا براوەن.

**فەرمانەکانی ڕاپۆرتی کەسایەتی:**

أ- کێشانی تابلۆیەکی پوخت و ڕاستی ئەو کەسانەی کە پەیوەندییان بە رووداوە ڕۆژانەییەکانەوە هەیە.
ب- وێناکردنی کەسێتی لەو بارودۆخانەی کە پێدا تێپەڕ دەبێت وەك ململانێ ڕامیارییەکان.
ت- خستنەڕووی هەندێ لایەنی کەسێتی کە ڕاپۆرتەکە باسی دەکات.

## ناونیشانی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی

دوو جۆر ناونیشان هەیە بۆ ڕاپۆرت:

١) ناونیشانی سەرەتایی/ ئەو ناونیشانەیە کە کە ئامادە دەکرێت بۆ ناونیشانی سەرەکی.

٢) ناونیشانی سەرەکی/ ئەو ناونیشانەیە کە دوای ناونیشانی سەرەتایی دێت.

| |
|---|
| **سەرەڕای باشبوونی خزمەتگوزارییەکان لە سلێمانی** / ناونیشانی سەرەتایی |
| **هاووڵاتیان دڵەڕاوکێیانە لەسەر داڕووخانی بارودۆخی خزمەتگوزاری**/ ناونیشانی سەرەکی |

**مەترسی تەشەنەکردنی توندوتیژی تایفی**

**زاڵمای خەلیل زاد: - جەنگی بەغداد داهاتووی عێراق دیاری دەکات**

زاڵمای خەلیلزاد باڵیۆزی ئەمریکا لە عێراقداری مەترسی گەشەکردنی جەنگی تایفی لە بەغداد دووپاتکردەوە و زەرورەتی ڕووبەڕووبوونەوەی عێراقییەکان بەرامبەر تیرۆر و هێزە دەرەکییەکان کە توندوتیژی لە وڵاتدا گەرمتر دەکات خستەڕوو ئەم ووریاکردنەوەی زاڵمای خەلیلزاد لە وتارێکدا هاتووە کە لە ڕۆژنامەی وول ستریت ژۆرنال لە ژێر ناونیشانی جەنگی بەغداد بڵاوکراوەتەوە: تیایدا ئاماژەی بە گرنگی ئەو شەڕە کردووە کە لە پێناوی دابینکردنی ئارامی عێراق ئەنجامدەدرێ. هەر لەو میانەیەدا وتی: شەڕی بەغداد داهاتووی عێراق دیاری دەکات تا ماوەیەکی درێژگرنگە بۆ دەستنیشانکردنی گرنگترین ناوچە لە جیهان و کاری قورسی دەوێ و کات بۆ عێراقییەکان زۆر پێویستە هەروەها هاوکاری ماددی و کەرەسەی پێویست بۆ بەدەستهێنان و بەدیهێنانی سەرکەوتن لە شەڕی بەغدادا.

ئەم وتارەی خەلیلزاد دوای تێپەڕبوونی شەش مانگ بەسەر ئەو هێرشەدا هات کە کرایە سەر هەردوو مەزارگەی ئیمامی عەسکەری لە سامەڕا لە ٢٢ی شوباتدا کە بە مەزندەی ئەو پریشکی هەڵگیرساندنی شەڕی تایەفی بوو تا گەیشتە ئەوەی بە توندی پەرەیسەند لە ناو شەقامەکانی بەغدادا هەروەها وتی: لەگەڵ ئەو دەستکەوتە ئانییە نوێیانەی ئەنجامدران وەك لە ناوبردنی سەرۆکی قاعیدە ئەبو موسعەب زەرقاوی و گواستنەی کاروباری ئەمنی شاری موسەنا بۆ هێزی ئاسایشی عێراقی، بەڵام عێراق ڕووبەڕووی قەیرانی قووڵ بۆتەوە لە بارودۆخی ئەمنی بەغدادا. لە لایەکی ترەوە خەلیل زاد ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە ٥٥٨ ڕووداوی توندوتیژی لە بەغداد لە ماوەی تەمووزی ڕابردوودا ڕوویداوە وە دەرکەوتووە کە ڕێژەکەی بەرزبۆتەوە بە بڕی ٪١٠ مانگانە.

کە ئەمەش مەترسی جەنگی ئەهلی توندی لێدەکەوێتەوە لە عێراق، و لە ئەنجامی ئەو هێرشانەدا ٢١٠٠ حاڵەتی مردن ڕوویداوە، هەروەها خەلیلزاد ڕوونی کردەوە کە توندوتیژی تایەفی ڕێژەی ٪٧٧ی تێکرای قوربانییەکانی لێکەوتۆتەوە. لەسەر وتارەکەی دەڕواو دەڵێ: پێویستە تەنها ئامارەکان پێوانەیی نەبن بۆ پێشکەوتن یان شکستخواردنی سەقامگیرکردنی بارودۆخی عێراق و دامرکاندنەوەی. ڕوون و ئاشکرایە توندوتیژی تایەفی کە خەڵکی بەغداد تووشی ترس و تۆقاندن کردۆتەوەو هەروەها سووربوو لەسەر بایەخی پایتەخت و وتی کە پێنج یەکی خەڵکی عێراق نیشتەجێی بەغدادن.

راپۆرتی راوبۆچوون بە شێوازی چوارچێوەی هەرەمی سەرەوژێرکراوی پلەکانە

## سەرەتا

زۆر کەس خاوەنی کۆمەڵێك زانیاری بایەخدارن کە ناتوانین ئەو زانیارییانەمان دەستبکەوێت تەنها لەسەر بنەمایەکی لۆژیکی ڕاست و لە ڕێگەی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسییەوە نەبێت، ئەگەر ئەو کەسانە خاوەن دەسەڵات بن ئەوا بە هۆی پلە پایەکەیانەوە لێدوانەکانیان بایەخی تایبەتی خۆی هەیە لای کۆمەڵ وەیان خاوەنی ناوبانگێك بن ئەوا ئاخافتنەکانیان جێگەی سەرنج و بایەخی جەماوەرەکەیە. جەماوەریش ئارەزووی دەستکەوتنی زانیاری دەکات لە لایەن بەرپرسان و خاوەن پلەو پێگەکان لە ڕێگەی لێدوان و خستنەڕووی گۆشەنیگای خۆیانەوە یان زانیاری کەسێتی کەسانی ناودار و ناسراو ئەویش لە ڕێگەی پرۆگرامی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسییەوە کە بە هۆی شارەزایی و توێژینەوە ئەکادیمییەکانەوە پێشکەوتنی بە خۆیەوە دیوە، بە شێوەیەکی وا تێبینی دەکرێ ئەنجامدەدرێ لەسەر بنەمایەکی بەهێز لە لایەن ڕۆژنامەنووسی بە تواناو شارەزاو کارامە و بوێر لە بەڕێوەبردنی ئاخافتنەکاندا، دەژمێردرێ.

چاوپێکەوتن یەکێکە لە جۆرەکانی هونەری ڕۆژنامەنووسی کە بایەخەکەی کەمتر نییە لە هونەرەکانی دی ڕۆژنامەنووسی. زۆرێك لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان چەند لاپەڕەیەکیان تەرخان دەکەن بۆ چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی لەبەر بایەخی ئەم هونەرە و پەسەندکردنی بەسەر هونەرەکانی تری ڕۆژنامەنووسیدا هەروەها زۆر لە هەواڵەکان لە ڕێگەی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسیەوە وەردەگیرێت.

بەشێك لە لێدوانەکە یان ئەو زانیارییەی لە کەسی بەرامبەرەوە لە کاتی چاوپێکەتندا دەستی کەوتووە دەخرێتە ڕوو بە دەستنیشانکردنی سەرچاوەکەی و دواتر چاوپێکەوتنەکە ئەو ڕۆژە یان ڕۆژی دواتر بڵاو دەکرێتەوە. بایەخی چاوپێکەوتن لە گرنگی ئەو کەسەوە دەردەکەوێ کە چاوپێکەوتنی لەگەڵدا سازدەکرێت بەهۆی بایەخی زانیاری و بۆچوونەکانی ئەمەش لە گرنگی پێگەی کەسەکەوە کە فرە توانا بێت و گرنگترین زانیاری لابێت و زۆرجار سەرنجەکانیان بایەخی زۆر گەورەی پێدەدرێت. زۆر



لە ڕۆژنامەنووسە کارامەکان چەندەها جار توانیویانە چاوپێکەوتنی مێژوویی گرنگ ئەنجامبدەن لەگەڵ پێشەواکانی جیهان و کەسایەتییە گرنگەکان و توانیویانە لەو ڕێگەیەوە پەیوەندی دۆستانەشیان هەبێت لە گەڵ ناودارانی جیهانی بە هۆی چاوپێکەوتن وکاری ڕۆژنامەنووسییەوە.

زۆر لە ڕۆژنامەنووسانی لێهاتوو دەرکەوتن و پێگەو شارەزایی توێژینەوەی ئەکادیمیانەیان بە دەستهێناوە و سوودیان بینیووە بە هۆی ئەنجامدانی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی و کارکردن لەو بوارەدا.

ڕۆژنامەنووس لە کاتی ئەنجامدانی چاوپێکەوتندا مەبەستی دەستکەوتنی زانیاری یان بیروڕا و یان ئاشکراکردنی لایەنی کەسێتی کەسێکە بەمە بەشداری هونەرەکانی تری ڕۆژنامەنووسی دەکات بۆ گەیشتن بە هەر ئامانجێك جۆرێك هونەری ڕۆژنامەنووسی هەیە کە جیاوازە لە جۆرەکانی دی.

## پێناسەی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی
## Definition of Interview

دەتوانین چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی پێناسە بکەین بە:

ئەو هونەرە ڕۆژنامەنووسییەیە کە هەڵدەستێت بە دروستکردنی ئاخافتن لە نێوان ڕۆژنامەنووس و کەسایەتییەك بۆ دەستکەوتنی هەواڵ و زانیاری نوێ یان لێکدانەوەی گۆشەنیگایەکی دیاریکراو یان لایەنی دانسقە و دەگمەن.

مێژووی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسییش دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژنامەگەریی ئەمریکی و ئەو سەردانەی کە ڕۆژنامەنووس (هۆراس گیرلی) ڕاسپێراوی ڕۆژنامەی نیویۆرك تەربیون بۆ بریگهام یۆنج و ئەنجامدانی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی لەگەڵ سەرەك خێڵی (مۆرۆن). چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی ساڵی **١٨٣٦** وەك هونەرێکی ڕۆژنامەنووسی دەرکەوت، دەتوانین باسی ئەو چاوپێکەوتنە بکەین کە ڕۆژنامەنووس (بنیت) لەگەڵ خانمێك ئەنجامیدا کە لە ماڵەکەیدا ڕووداوی کوشتن دەرهەق بە ئافرەتێکی لادەر ڕووی دابوو و دارشتنی چاوپێکەوتنەکەش بە شێوەی پرسیار و وەڵام بوو.

## قۆناغەکانی ئەنجامدانی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی
## Stages of Conducting Interview

**١. قۆناغی پێش ئەنجامدانی چاوپێکەوتن (خۆئامادەکردن):**

هەنگاوی یەکەمی خۆئامادەکردن بۆ ئەنجامدانی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی، هەڵبژاردنی ئەو بابەتەیە کە گفتوگۆی لەسەر دەکرێ و کەسێتی ئەو کەسەی کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجامدەدرێ ئەم هەنگاوەش ئەم ئامانجانەی هەیە:

أ- ئەو بابەتەی چاوپێکەوتنی لە بارەوە دەکرێت لە لایەن خوێنەرەوە گونجاو بێت.

ب- پێویستە ئەو کەسەی چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجامدەدرێت توانای پێویستی هەبێت بۆ بەخشینی زانیاری یان دەرخستنی گۆشەنیگای نوێ.

ت- ڕۆژنامەنووس دەبێت زانیاری کۆبکاتەوە لە بارەی ئەو بابەتەی کە گفتووگۆی لەسەر دەکات.

پ- ڕۆژنامەنووس دەبێت زانیاری تەواو کۆبکاتەوە لەسەر ئەو کەسەی کە چاوپێکەوتنی لەگەڵدا ئەنجامدەدات.

ج- ڕۆژنامەنووس پێویستە پێش چاوپێکەوتنەکە پرسیارەکان ئامادە بکات.

ح- ڕۆژنامەنووس دەبێت پێشوەخت، کاتی چاوپێکەوتن دیاری بکات و ئەو کەسەش ئاگادار بکاتەوە لە کاتی چاوپێکەوتنەکە ئەم قۆناغەش کۆمەڵێ پێداویستی خۆی هەیە:

١) ڕۆژنامەنووس ئەو کتێبانە بخوێنێتەوە کە ئەو کەسە دایناون یان لە بارەیەوە کەسانی تر نووسیویانە ئیتر ئەو کەسە نووسەر بێت یان شاعیر یان بیرمەند (مفکر) یان ئەدیب یان توێژەر یان سیاسەتمەدار.

٢) ڕۆژنامەنووس دەبێت ئاگاداری ئەو ئەو چاوپێکەوتنە گرنگانە بێت کە پێشتر لە گەڵ ئەو کەسەدا لە ڕۆژنامەو گۆڤار و ئێزگە و تەلەفزیۆنەکاندا ئەنجامامدراوە بۆ



ناسینی شێوازی بیرکردنەوەو جۆری بایەخدانەکانی و بۆ ئەوەی ئەو پرسیارانە دووبارە نەبنەوە کە پێشتر ئاراستەی کراون و وەڵامی داوەنەتەوە.

٣) ڕۆژنامەنووس دەتوانێت زانیاری بەهاداری دەستبکەوێت لەسەر کەسێتی ئەو کەسەو ئەویش لە ڕێگەی پەیوەندیکردن بەو ڕۆژنامەنووسانەی کە پێشتر چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ئەنجامداوە.

٤) زۆر لە ڕۆژنامەنووسانی گۆڤار و ڕۆژنامە جیهانییەکان بێجگە لەو زانیارییانەی بەردەستیان هەوڵی ئاشکراکردنی لایەنی تری نهێنی ژیانی ئەو کەسە دەدەن لە ڕێگەی گەڕانەوە بۆ ڕۆژانی خوێندن منالّی و دۆزینەوەی باس و خواسی ناو دەفتەری تۆمارگای قوتابخانە و دیداری هاوڕێیانی دێرینی ئەو کەسە دەستکەوتنی لایەنی مێژوویی ئەو کەسە.

٥) ڕۆژنامەنووس دەبێت زانیاری تەواوی هەبێت لە بارەی بابەتی چاوپێکەوتنەکەوە گەر ئەو کەسە پسپۆڕی بوارێکی تایبەت بێت (بۆ نموونە ڕۆژنامەنووس ناتوانێ چاوپێکەوتن بە سەرکەوتوویی ئەنجامبدات لەگەڵ پسپۆڕێکی بواری ئابووریدا گەر زانیاری نەبێت لەسەر ئابووری، هەروەها لەگەڵ پسپۆڕێکی شوێنەوارناسدا گەر شتێك لە بارەی شوێنە دێرینەکانەوە نەزانێ).

٦) هەڵبژاردنی پرسیاری شیاو، ڕۆژنامەنووس بەبێ ئامادەکردنی پرسیاری پێشوەخت سەرکەوتوو نابێ لە ئەنجامدانی چاوپێکەوتن لەبەرئەوە دەبێت پرسیارەکان ئامادەبکات لە بارەی بابەتی چاوپێکەوتنەکە ئیدی ئەو بابەتە ڕامیاری بێت یان ئابووری یان سەربازی یان کۆمەڵایەتی یان هونەری یان وەرزشی.

٧) دەبێت پرسیارەکان لەسەر بنەمای خوێندنەوەی ڕۆژنامەنووسی بێت بۆ بابەتەکە و توێژینەوەی کەسێتی وتەبێژەکە، ڕۆژنامەنووس دەبێت لە کاتی پرسیارکردندا بابەتی سەرەکی چاوپێکەوتنەکە ڕوون بکاتەوە. گەر بابەتی چاوپێکەوتن ڕامیاری بوو ئەوا نابێت داوا لەو کەسە بکرێ کە لەسەر هەموو لایەنێکی

ڕاميارى بدوێ زۆربەى جار بەشێكى بابەتەكە ديارى دەكرێت بۆ نموونە (ڕۆژنامەنووس پرسيار بكات سەبارەت بە سياسەتى عێراق يان سياسەتى ئەمريكى).

٨) پێويستە پرسيارى چاوپێكەوتنى ڕۆژنامەنووسى لايەنى پۆزەتيڤ لە خۆبگرێ نەك نيگەتيڤ مەبەستمان لە پرسيارى پۆزەتيڤ ئەو پرسيارانەيە كە وەڵامەكانيان زانيارى ياخود گۆشەنيگاى نوێ لەخۆدەگرێ، بەڵام لايەنى نيگەتيڤ ئەو وەڵامانەيە كە تەنها دووبارەكردنەوى زانيارى زانراو و كۆنە.

٩) دەبێت پرسيارەكان ڕيزبەند و لۆژيكى بن بە شێوەيەك خوێنەر ڕابكێشێت بە دواى خۆيدا بۆ سووربوون لە خوێندنەوەى، و دەبێت هەر پرسيارێك باشترو جياواز تر بێت لە پرسيارى پێش خۆى بەو مانايەى كە زانيارى زياتر پێشكەش بكات و تەواوكارى پرسيارى پێشتر بێت و گفتوگۆكە بەرەو پێش بەرێت تەنها لەسەر باسێك نەوەستا بێت.

١٠) دەبێت زمانى دەربڕينى پرسيارەكان ورد و ڕوون و بێ ڕتووش بێت و تێگەيشتنى لە لايەن ئەو كەسەى كە چاوپێكەوتنى لەگەڵدا ساز دەكرێت ئاسان بێت بۆ ئەوەى وەڵامى ڕوون و دياريكراو بدات بە دەستەوە.

١١) دەبێت زاراوەى گفتوگۆى ڕۆژنامەنووسى زۆر ڕوون بێت بۆ ئەوەى خوێنەر بە جياوازى ئاستى ڕۆشنبيرى و كۆمەڵايەتيانەوە تێيبگەن.

١٢) ڕۆژنامەنووس دەبێت بوێر بێت لە ئامادەكردنى پرسيارى توند يان پرسيارى كە ناوەڕۆكەكەى جياوازى يان دژى ئەو كەسە بێت كە ئاخاوتنى لەگەڵ دەكات، بەڵام بە مەرجێك بە شێوازێكى لە بارو گونجاو ئاراستەى بكات و بوێر بێت لە ئاراستەكردنى ئەو پرسيارانەى كە وەڵامەكانيان زانيارى زۆر گرنگ لەخۆدەگرێت.

١٣) پێويستە ڕۆژنامەنووس پرسيارەكان بنووسێتەوە پێش ئەنجامدانى چاوپێكەوتنەكە، بەڵام پرسيارەكان لە بەر بكات، نەك بە خوێندنەوە لە بەردەم



ئەو كەسەدا ئاراستەى بكات، چونكە ئەمە سەرنجێك لاى كەسەكە دروست دەكات كە ڕۆژنامەنووس بە بابەتەكە ئاشنا نييە.

١٤) جاروبار ڕۆژنامەنووس كاتى پێويستى نييە بۆ خۆ ئامادەكردنى پێشوەخت بۆ چاوپێكەوتنەكە چ لە بارەى لێكۆڵينەوەى كەسێتى ئەو كەسە، يان ئامادەكردنى پرسيارى گونجاو بۆ بابەتەكە. لە كاتەدا دەبێت پشت ئەستوور بێت بە زانيارى گشتى و ئاستى ڕۆشنبيرى خۆى و خوێندنەوەو ئەزموونى خۆى لە كارى ڕۆژنامەنووسيدا ئەمانە لە وانەيە ئەو بۆشاييە پڕ بكاتەوە كە نەيتوانيوە خۆى بۆ كاتە ناكاوەكان ئامادە بكات.

١٥) بۆ نموونە گەر داواكرا لە ڕۆژنامەنووسێك چاوپێكەوتنێك لەگەڵ وەزيرى دەرەوەى وڵاتە يەكگرتووەكانى ئەمريكا ئەنجام بدات كاتێ كە بە فڕۆكەخانەى كەركوكدا تێپەڕ دەبێت پاش دوو كاتژمێرو تەنها سێ كاتژمێر دەمێنێتەوە لە فڕۆكەخانەدا بۆ پڕكردنى بەنزين، ڕۆژنامەنووس ناچار دەبێت كە تەنها پشت ببەستێ بە ڕۆشنبيرى تايبەتى و پێشينەى مێژوويى خۆى، چونكە كەمى كات بوارى نادات پرسيار ئامادە بكات ياخود زانيارى لەسەر ئەو كەسەى كە چاوپێكەوتنى لەگەڵ دەكات كۆبكاتەوە لەبەرئەوە پێويستە بۆ ئەنجامدانى ئەو كارە هۆشمەندیی ڕۆژنامەنووسى هەبێت.

**٢. قۆناغى ئەنجامدانى چاوپێكەوتن (بەڕێوەبردنى گفتووگۆ):**

بەڕێوەبردنى ئاخاوتن لە چاوپێكەوتنى ڕۆژنامەنووسيدا پێويستە لەسەر نەخشەيەكى دياريكراو و لەسەر بنەمايەكى ئامادەيى پێشوەختى پرسيار بێت، كە ئەويش پێويستى بە چەند توخمێك هەيە لەوانە:

أ- ڕۆژنامەنووس دەبێت شێوازى نموونەيى هەڵبژێرێت بۆ دەستپێكردنى چاوپێكەوتنەكە و چوونە ناو گفتووگۆيەكەوە.

ب- دەستپێکردنی چاوپێکەوتن کاریگەریی هەیە لەسەر بەردەوامبوونی گفتوگۆکە و ڕاکێشانی یەکەمیە سەرنجی وتەبێژ هەر لە سەرەتاوە ئەمەش تێکرای چاوپێکەوتنەکە دیاری دەکات.
ت- ڕۆژنامەنووس دەبێت لە هەموو وشەیەك کە وتەبێژ دەری دەبڕێ بەئاگا بێت و بە باشی گوێبیستی بێ و تێبینی بەهێزی هەبێت بۆ دەستکەوتنی هەر زانیارییەکی لاوەکی کە ڕاستی ڕووداوێکی کاریگەر ئاشکرا دەکات.
پ- ڕۆژنامەنووس دەبێت پەروەردەییانە هەڵسوکەوت بکات لەگەڵ کەسی بەرامبەر بەڵام لە هەمانکاتدا دەبێت دوودڵ نەبێت لە بڕینی بابەتەکە بە قسەبێژەکە گەر لە بابەتەکە لایدا.
ج- ڕۆژنامەنووس نابێت قسە بە قسەبێژەکە ببڕێت کاتی لە قووڵایی بابەتەکەدایە چونکە لەوانەیە بڕینی قسەکە پێی بێبەری بکات لە هەواڵێکی گرنگ یان بۆچوونێکی کاریگەر کە قسەبێژ دەیدرکێنێ.
ح- ڕۆژنامەنووس دەبێت بەو شێوەیەی کە دەیەوێت کۆنترۆڵی ئاخاوتنەکە بکات.
خ- بێگومان ڕۆژنامەنووس دەبێت پرسیارەکان تەنها لەسەر مەسەلە بنەڕەتیەکان و ئەوانەی کاریگەرییان بۆ خوێنەر هەیە و بایەخدارە لایان و پەیوەندی بە بەرژەوەندی خوێنەرانەوە هەیە و گۆشەنیگای نوێ ئاشکرا دەکات.
د- دەبێت گفتوگۆکان دوور بن لەو زانیارییانەی کە دڵنیا نین لە ڕاست و ڕەوانی یان بۆچوونی بێ بنەما و پڕوپاگەندەیی.
ژ- ڕۆژنامەنووس دەبێت سوور بێت لەسەر ئەو زانیارییانەی کە ڕاستی بەڵگەداری تێدایە نەك خەیاڵی و پڕۆپاگەندە بێت.

ڕۆژنامەنووس دەبێت ئامێری تۆمارکردن (تسجیل)ی پێبێت بۆ تۆمارکردنی دەنگ و ئەو ڕۆژنامەنووسەی کە تۆمارکەر بەکاردێنێ دەبێ پابەند بێت بەم ڕێسایانەوە:
١) شارەزای بەکارهێنانی ئامێری تۆمارکردنەکەی بە باشی بێت.
٢) کاسێتی یەدەکی پێبێت.



٣) مۆڵەت وەربگرێ لە کەسی بەرامبەر بۆ بەکارهێنانی ئامێرەکە و تۆمارکردنی دەنگی.

لایەنێکی تری بایەخدار لە ئەنجامدانی گفتوگۆدا کە ئەوەیە ڕۆژنامەنووس پێویستە بایەخی پێبدات، چۆنیەتی و جۆری بەکارهێنانی زاراوەکانە. بۆ نموونە کاتێ کە چاوپێکەوتن لە گەڵ کەسێك دەکرێت کە پایەی سەرۆك کۆماری هەیە دەبێ دەستەواژەی (جەنابی سەرۆك) بەکاربهێنێ، بەڵام لە هەموو پرسیارێکدا دووبارەی ناکەیتەوە. ئەگەر ئەو کەسە پایەی سەرۆك وەزیرانی هەبوو دەبێ دەستەواژەی سەرۆك وەزیران بەکاربهێنرێ، بەڵام ئەگەر پایەی وەزیر بوو دەستەواژەی بەڕێز وەزیر، و لە کاتی چاوپێکەوتنی باڵیۆزی یەکێ لە دەوڵەتەکان دەستەواژەی جەنابی باڵیۆز، و دەستەواژەی جێنشین (امیر) گەر چاوپێکەتن لەگەڵ یەکێ لە پادشایانی میرنشینەکاندا بوو.

**٣. قۆناغی دوای ئەنجامدانی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی (نووسینی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی):**

پێش ئەوەی دەستبکەیت بە داڕشتنی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی دەبێت ڕۆژنامەنووس ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکات:
أ- بە وردی بە بابەتەکەدا بچێتەوە بۆ تێگەیشتن و دڵنیابوون لەوەی کە ئایا وەڵامی پێویستی دەستکەوتووە بۆ هەموو پرسیارەکانی تایبەت بە چاوپێکەوتنەکە.
ب- ڕۆژنامەنووس پێویستە زانیاری و دەرخستەکان هەڵسەنگێنێ بۆ ئەوەی بزانێ ئەوەندە بەسە بۆ دەرخستنی بابەتی چاوپێکەوتنەکە.
ت- دڵنیابوون لە تەواوبوونی چاوپێکەوتنەکە لە هەموو ڕوویەکەوە وەك وێنە و بەڵگە و خشتەکان.

## جۆری ئەو کەسانەی کە چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا ساز دەکرێت

**١. کەسی ڕوون (ئاشکرا):**

ئەو کەسەیە کە وەڵامی پرسیارەکان زۆر بە ئاشکراو ڕوون دەداتەوە، و ئارەزووی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی هەیە بۆ دەستکەوتنی ناوبانگ و دەرکەوتنی ناوی لە ئاستی کۆمەڵدا. ڕۆژنامەنووس لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەدا تووشی هیچ کێشەیەك نابێت لە کاتی وەرگرتنی زانیاری و ڕاوبۆچوونیدا.

**٢. کەسی ڕاڕا:**

ئەو کەسەیە کە ئارەزووی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی دەکات، بەڵام لە هەمانکاتدا دەترسێ لە ئەنجامدانی چاوپێکەوتن و مامەڵەکردن لەگەڵ ڕۆژنامەدا بەهۆی ئەو کێشانەی کە لەوانەیە دووچاری بێتەوە، لەم کاتەدا ڕۆژنامەنووس پێویستە خۆی ماندوو بکات و توانای هەبێت هانی بدات بەوەی کە قسەکانی چەندە سوودمەندە و پێی بڵێ کە ئەو زانیاری و بۆچوونی بایەخداری لایە و چاکە بدوێ بۆ ڕۆژنامەکان هەروەها هەندێ شێوازی تر بگرێتە بەر بۆ ڕازیکردنی کەسی ڕاڕا و دوودڵ بە پیاهەڵدان و ستایشکردنی و وا خۆی دەربخات کە شتی زۆر گرنگ لە بارەی مێژووی ژیانییەوە دەزانێت و وا خۆی دەربخات کە شێوازی هەڵسوکەوتی کارەکانی دەزانێ و کەسایەتی ئەو کەسە جێگەی بایەخی خوێنەرە.

**٣. کەسی هەڵهاتوو:**

ئەم جۆرە کەسانە سرووشتیان وایە حەزیان لە ئاخاوتن نییە بۆ ڕۆژنامەکان و بڕوایان بە کەس نییە، بە تایبەت بە ڕۆژنامەنووسان، ئەم جۆرە کەسانە گۆشەگیر و کەمدوون. خۆیان دەپێچنەوە و گەر ڕۆژنامەنووسێ داوای چاوپێکەوتنی لێبکات دەڵێت ناتوانم هیچ شتێکت پێ بڵێم، گەر پرسیار بکرێ لێیان سەبارەت بە بۆچوونیان لەسەر بابەتێکی دیاریکراو لە وەڵامدا تەنها دەڵێ هیچ لێدوانێکم نییە. لەو کاتەدا ڕۆژنامەنووس دەتوانێ بپرسێ بۆ ناتەوێ لێدوان بدەی؟ ئایا هۆیەکی تایبەتی یان گشتی هەیە ڕێگەت پێنەدا بدوێی بۆمان؟



## پرسیارەکانی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی

چوار جۆر پرسیار هەیە کە ڕۆژنامەنووس ئاراستەی کەسی بەرامبەری دەکات:

**١. پرسیارێك بە ئامانجی دەستکەوتنی ژمارە:**

ئەو پرسیارەیە کە دەکرێ لە پێناوی دەستکەوتنی ژمارە لە کەسی بەرامبەر.

بۆ نموونە / بڕی خەرجی پڕۆژەکانی بنیادنانەوە لە کوردستاندا بۆ ئەم ساڵ چەندە؟

ئامانجی ئەم پرسیارە ژمارەیەکی دیاریکراوە کە کەسی بەرامبەر وەڵام دەداتەوە. کە بڕی تێچوونی ئەو پڕۆژەیە بۆ ئەمساڵ دە ملیار دیناری تێپەڕاندووە.

**٢. پرسیارێك بە ئامانجی دەستکەوتنی زانیاری:**

ئەم جۆرە پرسیارە مەبەستی دەستکەوتنی زانیارییە سەبارەت بە لایەنێك یان تەوەرێکی دیاریکراوە. بۆ نموونە/ دوا پڕۆژەتان چییە کە بە نیازتانە لە ساڵی داهاتوودا جێبەجێی بکەن؟ مەبەست لەم پرسیارە دەستکەوتنی زانیارییە لە بارەی ئەو پڕۆژانەی کە جێبەجێ دەکرێ لە ساڵی داهاتوودا ڕۆژنامەنووس لەو نێوەندەدا ئامانجی ئاشکراکردنی نەخشەی ساڵانەیە بۆ ساڵی داهاتوو.

**٣. پرسیارێك بە ئامانجی دەستکەوتنی ڕاوبۆچوون:**

ئامانجی ئەم پرسیارە دەستکەوتنی ڕاوبۆچوونێکی دیاریکراوە لە بارەی مەسەلەیەکی دیاریکراوەوە. زۆر جاریش خاوەنی بۆچوونەکە کەسێکی نەناسراوە و بەرپرسیارێتییەتییەکی گەورەی لە ئەستۆدایە بۆ ئاشکراکردنی ڕای خۆی پرسیاری ئاراستە دەکرێ بۆ نموونە: جەنابی سەرۆك بۆچوونتان چییە سەبارەت بەو گۆڕانکارییانەی کە لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕوودەدات؟

ئامانج لەم پرسیارە ئاشکراکردنی بۆچوونی سەرۆکە لەو گۆڕانکارییانەی کە لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا درێژەی هەیە.

**٤. پرسیارێك بە ئامانجی دەستکەوتنی زانیاری کەسێتی:**

ئەم جۆرە پرسیارە مەبەستی دەستکەوتنی زانیاریی تایبەتە بە ژیانی تایبەتی ئەو کەسانەی کە ڕۆژنامەنووس چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا دەکات.

بۆ نموونە/ هاندەرت چیبوو کە بچیتە ناو جیهانی هونەرەوە؟
مەبەستی ئەم پرسیارە زانینی زانیاری کەسێتییە لە بارەی ئەو کەسەو چۆنیەتی چوونە ناو بواری هونەرییەوە. ڕۆژنامەنووس دەتوانێ ئەو پرسیارانە بکات کە لە وەڵامەکانیدا زانیاری کەسێتی ئاشکرا دەکات بە هۆی ئارەزووی خوێنەران بۆ زانینی زانیاری زیاتری کەسێتی نەك بۆچوون.
لە ئاکامی ئەو توێژینەوانەی کراون، دەرکەوتووە کە مرۆڤ خوازیاری زانینی زانیارییە سەبارەت بە دەوروبەری خۆی بە تایبەت زانیاری لە بارەی ناودارەکان. لەبەرئەوە ڕۆژنامەنووس دەبێ ئەو کەسەی کە چاوپێکەوتنی لەگەڵدا دەکات پرسیارەکانی لەو چوار جۆرە پرسیارە بێت و دەبێت ڕەچاوی داخوازی خوێنەران بکات بۆ زانینی زانیاری.
ڕۆژنامەنووس دەبێت پابەند بێت بە ئاراستەکردنی سێ پرسیار بۆ دەستکەوتنی زانیاری و ژمارە بەرامبەر تەنیا پرسیارێك بۆ دەستکەوتنی بۆچوون یان دەستکەوتنی زانیاری کەسێتی ئەگەر کەسەکە یەکێکە لە ناودارانی بواری هونەری یان وەرزشی و زانستی.

## شێوازی هونەری نووسینی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی

**١. شێوازی چوارچێوەی هەرەمی سەرەوژێرکراو:**

أ- پێشەکی چاوپێکەوتن:

پێشەکییەکە یەکێك لەم خاڵانەی خوارەوەی لەخۆگرتووە:

١) پێناسەیەکی پێشینەی بابەتی چاوپێکەوتنەکە و گرنگترین ئەو تەوەرانەی کە باسی دەکات.
٢) یاخود ژمارەیەك پرسیار کەلە ناوەڕۆکی چاوپێکەوتنەکەدا کەسی بەرامبەر وەڵامی دەداتەوە.
٣) یان کورتەیەك لە ژیانی ئەو کەسەی کە چاوپێکەوتنەی لەگەڵدا ساز دەکرێت.



ب- کرۆکی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی:
کرۆکی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی بریتییە لەو وەڵامانەی کە زانیاری لەخۆدەگرێ و دەتوانرێ زانیارییەکان لە سەرەتادا ژمارەو ئاماری گرنگ بێت دواتر ئەو وەڵامانەی کە بۆچوونی تێدایە.




**٢. شێوازی چوارچێوەی هەرەمی ڕێك (story):**

دەتوانین چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی بەم شێوازە بنووسین ئەگەر ڕۆژنامەنووس ئامانجی ناساندنی کەسێکی ناودار بێت بە خوێنەر.
ئەم شێوازەش لە دووبەش پێك دێت:
أ – پێشەکی: نووسینی پێشەکی چاوپێکەوتن لەم شێوازەدا پێناسەیەکی ئەو کەسەیە کە چاوپێکەوتنی لەگەڵدا دەکرێت و ژمارەی وشەکانی پێشەکی لە نێوان ٥٠ تا ٧٠ وشە زیاتر نەبێت پێش ئەوەی ڕۆژنامەنووس بگاتە ئاراستەکردنی پرسیار.
ب- کرۆکی: لە کرۆکی چاوپێکەوتندا پرسیار و وەڵامەکەی دادەنرێت لە پرسیاری پێناسینەوە تا ئەو پرسیارانەی کە پەیوەندی هەیە بە لایەنی کەسێتی کەسی بەرامبەرەوە، سەرەتای پرسیاری ڕۆژنامەنووس لە بارەی سەرەتاکانی ژیانی ئەو کەسەوەیە بۆ ئەوەی زنجیرەی مێژووی ژیانی بناسرێت.

## جۆرەکانی پێشەکیی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی

١) پێشەکییەك کە باس لە بابەتی چاوپێکەوتنەکە دەکات:

باسی لەو بابەتە دەکات کە ڕۆژنامەنووس مەبەستێتی چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرامبەردا بکات وەك باسێك لە بارەی سیاسەتی ئەمریکا لە عێراق.

٢) پێشەکییەك کە باس لە کەسێتی ئەو کەسە دەکات کە چاوپێکەوتنی لەگەڵدا دەکرێت:

واتە باسی ژیانی ئەو کەسە و ئاراستەکانی و بایەخپێدانەکانی. ئەم جۆرە پێشەکیانە زیاتر لە چاوپێکەوتنی هونەری و وەرزشیدا بەکاردێت.

٣) پێشەکییەك کە باسی هەلومەرجی شوێنی چاوپێکەوتنەکە دەکات:

ئەو پێشەکییەیە کە باسی شوێنی ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکە دەکات، ڕۆژنامەنووس ئەم جۆرە پێشەکیە بەکاردێنێ بۆ ناساندنی شوێن و ژینگەی چاوپێکەوتنەکە بۆ خوێنەر بە شێوەیەك کە خوێنەر وا هەست بکات کە خۆی لەوێیە.

٤) پێشەکییەك کە پرسیارە:

ڕۆژنامەنووس لەم جۆرە پێشەکییەدا ڕستەی پرسیاری لەسەر بابەتی چاوپێکەوتنەکە بەکاردێنێ.






## پێداویستییەکانی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی
## Requirements of Interview

١. کۆکردنەوەی زانیاری لە بارەی بابەتەکەوە.

٢. دەبێت ڕۆژنامەنووس زانیاری فرەی دەستبکەوێت لە بارەی بابەتەکەوە لە بەڵگەنامەی سەرچاوەی جۆراوجۆر، گەر بابەتەکە پەیوەندی هەبوو بە جەنگی ئەهلی لە یەکێ لە وڵاتاندا ئەوا دەبێت ڕۆژنامەنووس زانیاری تایبەت بە بارودۆخی ئەو وڵاتە و مێژوو و نەتەوەکان کە تێیدا دەژین کۆبکاتەوە، بێجگە لە چۆنیەتی هەڵگیرساندنی جەنگ تێیدا و ئەو کۆمەڵ و گروپانەی کە دەجەنگن.

٣. دڵنیا بوون لەو زانیارییانەی کە تایبەتە بە بابەتی چاوپێکەوتنەکەوە:

٤. ڕۆژنامەنووس پابەندە بە زانینی درێژەی باس و زانیاری وردو ڕاست لەسەر بابەتی چاوپێکەوتنەکە پێش ئەنجامدانی چاوپێکەوتن، چاوپێکەوتن لەگەڵ یەکێ لە سیاسەتمەدارانی ئەمریکادا دەبێت ئاراستەی سیاسەتی ئەمریکاو فەلسەفەی دیارترین مەسەلەی بایەخداری بزانێ. ئەگەر بابەتەکە سیاسی بوو، دەبێ لایەنێکی دیاریکراوی سیاسەت لەخۆبگرێ بۆ نموونە: تەنها بابەتی سیاسەتی ئەمریکا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دیاری بکات یان ئاراستەی ئەوروپا یان ئێران.

٥. کۆکردنەوەی زانیاری لە بارەی ئەو کەسەی کە چاوپێکەوتنی لەگەڵدا دەکرێت.

ڕۆژنامەنووس بێ ناسینی ئەو کەسەو بێ بوونی زانیاری لە بارەیەوە ناتوانێ سەرکەوتوو بێت و چاوپێکەوتنێکی باش ئەنجامبدات وەك نەزانێك دەردەکەوێ، بە لایەنی کەمەوە زانیارییەکی کەمیش بێت هەیبێت لەسەر ئەو کەسە (ناوی، تەمەنی، بایەخەکانی، نەریتی، خووی، وابەستەبوونی، ئاستی خوێندنی، پلەوپایەی، باری دەروونی، ئاستی ڕۆشنبیری).

٦. دارشتنی پرسیارەکان.

٧. دەبێت ڕۆژنامەنووس پرسیارە گرنگەکان دابڕێژێت دواتر ئەو پرسیارانەی کە بایەخی کەمتریان هەیە.. ڕۆژنامەنووس دەتوانێ پرسیارەکان ڕیزبەند بکات لە پرسیارێکەوە بۆ پرسیارێکی تر بە شێوەیەکی لۆژیکی.

٨. دیاریکردنی کاتی چاوپێکەوتن:

٩. زۆربەی بەرپرسان داخوازن بوارێکیان پێبدرێت پێش ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکە و زانیارییان پێبدرێت لە بارەی تەوەری باسەکەوە، لە بەر ئەوەی ڕۆژنامەنووس دەبێت بە داوایەکی فەرمی داوای دیاریکردنی کاتی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکات.

١٠. پابەندبوون بە بابەتی چاوپێکەوتنەکەوە:

١١. ڕۆژنامەنووس دەبێت پابەند بێت بە بابەتی چاوپێکەوتنەکە واتە لە بابەتی دیاریکراو دەرنەچێت. گەر بابەتەکە ڕامیاری بوو نابێت پرسیاری ڕۆشنبیری یان هونەری و وەرزشی بکرێت هەروەها پابەند بێت بە بابەتێکی دیاریکراوو جۆری پرسیارەکانەوە.

١٢. دەستکەوتنی وێنە و بەڵگەی پەیوەندیدار بە بابەتی چاوپێکەوتنەکە:

١٣. ڕۆژنامەنووسیش پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ دەزگاکەی خۆی و بابەتەکەی کۆتایی پێبهێنی، دەبێ بزانێ کە چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی پێویستی بە بەڵگە هەیە بۆ بڵاوکردنەوە، بۆیە دەبێت پابەند بێت بە پەیداکردنی وێنەی ئەو کەسەی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا ساز دەکات، بێجگە لەو بەڵگانەش کە لەسەر بابەتەکە کۆی دەکاتەوە.



## چەشنەکانی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی
## Shapes of Interview

**١. چاوپێکەوتنی زانیاری:**

ئەم جۆرە چاوپێکەوتنانە ئامانجیان دەستکەوتنی زانیارییە لە کەسی بەرامبەر بە بەڵگەی ژمارەو ئامار، بۆ بە وردی بڵاوکردنەوەی، ئەم جۆرە زانیارییانە بە گوێرەی جۆری چاوپێکەوتن دەگۆڕێ بۆ نموونە لە چاوپێکەوتنی ڕامیاریدا ئامانجی ڕۆژنامەکە دەستکەوتنی زانیارییە لە بارەی ئەو بابەتەی کە چاوپێکەوتنی لە بارەوە ئەنجامدراوە، بەڵام لە چاوپێکەوتنی هونەریدا زانیارییەکان هونەرییە ئەمەش ڕێگە لەوە ناگرێ کە هەندێ بۆچوونی تر وەربگیرێ.

**٢. چاوپێکەوتنی ڕاوبۆچوون:**

ئامانج لەم چاوپێکەوتنە دەستکەوتنی ڕاوبۆچوونە، و زۆرجاریش ڕۆژنامەنووس ئەو کەسە هەڵدەبژێرێت کە بۆچوونەکانی لە لایەن خوێنەر بایەخی پێدەدرێت. چونکە لە چاوپێکەوتنی زانیاریدا خوێنەر زیاتر بە پلەی یەکەم بایەخ دەدات بە زانینی زانیاری و بە پلەی دووەمیش کەسەکە گرنگە بە لایەوە، بەڵام لە چاوپێکەوتنی ڕاوبۆچووندا خوێنەر بە پلەی یەکەم بایەخ بە کەسی بەرامبەر دەدات دواتر ڕاو بۆچوون و لێدوانەکانی.

**٣. چاوپێکەوتنی کەسێتی:**

ئەم جۆرە چاوپێکەوتنانە ئامانجی پێناسەی کەسێتی کەسایەتییە ناودارەکانە بە خوێنەر، چونکە خوێنەر لە بارەی ئەو کەسەوە زانیاری تەواوی نییە، جاروبار (بە چاوپێکەوتنی (ڕابواردن و سەرگەرمی و خۆشی) ناودەبرێت چونکە هاوکاری دەکا لە کات بەسەربردنێکی خۆشی خوێنەر، ئەم جۆرە چاوپێکەوتنە بە هۆی بایەخپێدانی

خوێنەرانەوە بۆ زانینی زانیاری ورد لە بارەی کەسایەتییەکی هونەری و وەرزشوانی، ڕۆژنامەنووس لە بەر ئەوە هەڵدەستێ بە ئەنجامدانی چاوپێکەوتن ئەو کەسە زانیاری کەسێتی پێشکەش دەکات بە مەبەستی پڕکردنەوەی فرە پرسی خوێنەر.

**٤. چاوپێکەوتنی خەیاڵی (تارمایی یان تەوباوی):**

ئەم جۆرە چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەنووس بە بێ بینینی کەسی بەرامبەر ئەنجامیدەدا، هەر خۆی وەڵامی پرسیارەکان دەداتەوە، بەڵام بە مەرجێك دژی بیروبۆچوونی ئەو کەسە نەبێت، بۆ نموونە کاتێك ڕۆژنامەنووسێك لە هزری خۆیەوە چاوپێکەوتنێك ئەنجامدەدا لەگەڵ ئەرەستۆ، ئەوا دەبێت وەڵامەکان پڕاو پڕ لەگەڵ ئاراستەو بیروبۆچوونی ئەرەستۆدا بگونجێت، گەر پرسیاری لێبکات سەبارەت بە بڵاوبوونەوەی ئەو بیروباوەڕانە لە سەردەمی پەیوەندیەکان (ڕاگەیاندن) و جیهانگیری، ئەوا لە وەڵامدانەوەیدا دەبێت لە چوارچێوەی بیرکردنەوەی ئەرەستۆ لە و بارەیەوە دەرنەچێت.

**گیانی کوردایەتی**

ولیەم سافیر / ڕۆژنامەی نیویۆرۆك تایمز

بە درێژایی سەدەی بیستەم سەرۆك بارزانی سەرکردەی (٢٠) ملیۆن کورد بووە، کە گەورەترین نەتەوەن لە جیهاندا تا ئێستا دەوڵەتیان نییە. لە ماوە ساڵانی هەفتاکاندا گەلی کورد دووچاری خیانەت بوونەتەوە لە لایەن شای ئێران و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە، پاش ئەوە سەرۆك گواستییەوە بۆ نێو ماڵێکی هێمن لە ولایەتی فەرجینیا و لەوێ زۆر گفتوگۆ لە نێوانماندا دروست بوو تا ئەو کاتەی کۆچی دوایی کرد.

لەبەر ئەوەی کوردی عێراق زۆر درەنگ چەتری پاراستنی ئاسمانییان بۆ کرا لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکانەوە و سیستەمێکی دیموکراسیانەی تێدا دامەزرا کە نموونەیەکی زیندووە بۆ عێراقی دوای سەدام.

بارزانی هاوڕێم ئەم بوارەی بۆ ڕەخساندم کە ئەم چاوپێکەوتنەی لەگەڵدا ساز بکەم:



* ولیەم.: ئایا کوردەکان لەم دوواییانەدا متمانەییان بەرامبەر ئەمریکییەکان پەیدا کردەوە؟

& بارزانی: گووتەیەکی کوردیمان هەیە کە دەڵێ. (کورد دڵسۆزی نییە)، ئەمریکییەکان تا ئەو کاتەی کە لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەکانەوە و ساڵی ١٩٩١ دیمەنی نیو ملیۆن کوردیان بینی کە ئاوارە بوون و لە ئەنجامی تاوانکاری و قەسابخانەکانی سەدام بەرامبەرییان ئەوجا هەستیان بە شەرمەزاری کرد و هەڵوێستیان وەرگرت و پاراستنی ئاسمانییان بۆ کورد دابینکرد. ئێمە سوپاسیان دەکەین کە بۆ ماوەی ئەم دە ساڵە پاراستینیان و بە ئازادی دەژێین.

* ولیەم.: ئەگەر وایە ئەی بۆچی کوردەکان پاش ڕزگاربوونی بەشەکەی تری عێراق دڵەڕاوکێیانە؟

& بارزانی.: لەبەر ئەوەی بڕوایان وایە کە جارێکی تر تووشی خیانەت دەبنەوە بە هۆی ڕێککەوتنی تورکەکان لەگەڵ ئەمریکییەکان و بە ڕێگەپێدانی تورك بە کردنەوەی بنکەی سەربازی باکوور لە ناو خاکیدا. خۆتان دەزانن کە تورکەکان کە چەکیان نەدا بە هێزی پێشمەرگە کە مەسعودی کوڕم سەرکردایەتیان لەگەڵ هێزەکانی جەلال تاڵەبانیدا کە ژمارەیان دەکاتە (٧٠) هەزار جەنگاوەر لە کوردستاندا، کە یارمەتیتان دەدەن بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام، بەڵام هاوکاری چەك و تەقەمەنی ناکەن بۆ لە ناوبردنی دوژمنە هاوبەشەکەمان.

* ولیەم: ئایا وای نابینی کە تورکیا مەترسی لە دروستبوونی کوردستانێکی سەربەخۆ هەیە لە عێراق و بەوەش (١٢) ملیۆن کوردی تورکیا دابڕێت لە تورکیاو پاڵبدا بە کوردەکانی عێراقەوە بۆیە هاوکاریتان ناکات؟

& بارزانی: ئەوە تەنها خەونێکە، ئایا بڕوات وایە دوای ئەوەی ئێمە حوکمی زاتی و ئارامی مسۆگەر بکەین بمانەوێ جەنگ بەرپا بکەین لە گەڵ تورکیا و وڵاتە یەکگرتووەکاندا کە ئەوان یەکێتی خاکی عێراق دەپارێزن دوای سەدام؟

تورکەکان مەترسی جیابوونەوەی کوردەکان دەکەن بە بیانوو بۆ ئەوەی کەلتوور و کەلەپووری کورد بسڕنەوە لە تورکیا ئەگینا بۆ ئەوە نییە کە پڕۆسەکە هەڕەشەیەك بێت بۆ سەر ئەوان، ئایا تۆ بڕوا دەکەی بە تورکەکان؟

* ولیەم: لەم دواییانەدا تورکیا تووشی بێ هیوایی کردین، بە تایبەت دوای ئەوەی (ناتۆ) ناچاری کردین کە تەقەمەنی نارد بۆ تورکیا و قایل بووین بە پێدانی قەرز پێی کە نزیکەی (١٥) ملیار دۆلار لەگەڵ ئەوەش چۆن دەتوانین نارەزایی خۆمان دەربڕین بەرامبەر هەڵوێستی تورکیا لە پاڵپشتیکردنی بۆ هەڵوێستی فەرەنسا و ئەڵمانیا بۆ پاراستنی سەدام، لە کاتێکدا ئێمە پیادەی دیموکراسی دەکەین.

& بارزانی: نارەزایی دەرمەبڕن، لە کاتێکی گونجاودا هەستتان کرد کە تورکیا دەیەوێ دەست بەسەر بیرە نەوتەکانی کەرکوکدا بگرێ، کە پایتەختی باوباپیرانمانە، لە ژێر ناونیشانی ئەوەی کە ئێمەی کورد دەمانەوێ دەوڵەتێکی سەربەخۆ پێکبهێنین، ئێوە بەخت یاوەرتانە کە ئیسلامییەکانی ناو پەرلەمانی تورکیا هەڵی خەڵەتاندون.

* ولیەم: بەڵام بینیتان کە، لە ڕێگەی خاکی تورکیاوە لە باکوورەوە هێرشکردن ماوەی هەفتەیەك جەنگەکەی کورت کردەوە؟

& بارزانی: گومانی تێدا نییە کە لەو نزیکەوە بنکەیەکی هێزی کوردی هەبوو بە سەرۆکایەتی مەسعودی کوڕم و هاوکاری دێرینم جەلال لەوپەڕی ئامادەباشیدا بوون بۆ هاوکاریکردنتان و نیشتنەوەی فڕۆکە جەنگییەکانتان لەسەر خاکی کوردستان لە گەڵ (٥) هەزار سەرباز و تانك و زرێپۆش. ئەمە هاوکات بوو لەگەڵ هێرشەکەتان لە ڕێگەی کوێتەوە و چوونە ژوورەوەی هێزی بریتانی بۆ ناو خاکی عێراق لە ڕێگەی ئوردنەوە، ئێمە پاڵپشتی ئەو هێرشانەمان کرد.

* ولیەم: ئایا ڕاهاتنی جەنگاوەرانتان لە جەنگی شاخ کۆسپ نەبوو بۆ هەڵسوکەوت کردنیان لەگەڵ سوپایەکی هاوچەرخی پێشکەوتوو؟

& بارزانی: کاتێك هێزی پێشمەرگە پڕچەك بکرێ بە موشەك و جل و بەرگ و ئامرازەکانی دژی چەکی کیمیاوی و دەمامکی دژی گازی ژەهراوی و تانك و زرێپۆش،



نەخێر، و پاککردنەوەی (جند الاسلام) کە هاوپەیمانێکی ڕێکخراوی قاعدەیە بەڵگەی قسەکانمانەوە ئامادەیی هەزاران لەو کوردانەی کە هەرگیز ژەهراوی کردنی هەڵەبجە و خنکاندنی منالآنمان بە گازی ژەهراوی یان بیر ناچێ، بۆ هاوکاریکردنتان و لە ناوبردنی هێزەکانی (حرس جمهوری) لە شەقامەکانی بەغدا گەر پێویست بکات.

* ولیەم: ئایا ئێستا عێراق لەگەڵ هەموو ئەو جیاوازییە مەزهەبی و ئایینی و نەتەوەییە دەتوانێ یەکگرتوو بێت و خۆی حوکمی خۆی بکات؟

& بارزانی: بەڵێ و زۆر لەوەش خێراتر کە هەندێ لە دیموکراسیخوازان و گەورەکانی ئەوروپا پێشبینی دەکەن، ئێوە یارمەتیمان دەدەن بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی فیدراڵ و هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی، فیدراڵی و پێکهێنانی دادگا و بە درۆخستنەوەی ئەو قەرزەی نێوان سەدام و ڕووسیا و بە شێوەیەکی چالاك تر لە ڕێکخراوی ئۆپك کاردەکەین، و کۆتاییهێنانی هەڵوێستە خراپەکانی تورکیا و ئێران، و پێمان بڵێن خواتان لە گەڵ. ئەو کاتە لە خیانەتی ڕابردووتان دەبوورین، هەرکاتێك مەسعودی کوڕم و جەلال تالەبانی-تان بینی پێیان بڵێن: من فەرمانم بۆ کورد دەرکرد کە یەکگرتوو بن.

## جۆرەکانی چاوپێکەوتن
## Kinds of Interview

### ١. چاوپێکەوتنی ڕامیاری:

ئامانجی ئەم جۆرە چاوپێکەوتنانە دەستکەوتنی زانیاریی یان بۆچوونە لە بارەی مەسەلەیەکی ڕامیاری کە جێگای مشتومڕە. زۆرینەی ڕۆژنامەنووسان مەبەستیان دەستکەوتنی زانیاری و ڕاوبۆچوونە لە بارەی ئەو مەسەلانەی کە خوێنەر ئارەزووی زانینی دەکات.

**٢. چاوپێکەوتنی کێشەوململانێ:**

ئامانج لەم چاوپێکەوتنە دەستکەوتنی زانیاری و بۆچوونە لە بارەی ڕەوشی ئاسایشی و ئەو زانیاریانەی کە پەیوەستە بە قەیرانەکان، و ئەو جەنگ و ململانێیانەی کە ڕوودەدات.

**٣. چاوپێکەوتنی ئابووری:**

ئامانجی تیشك خستنە سەر لایەنێکی دیاریکراوی ئابووری و ژیانی ئابوورییە، لەو وڵاتانەی کە ڕۆژنامەکەی لێدەردەچێت یان وڵاتانی تر. دەبێت ڕۆژنامەنووس زانیاری هەبێت لە بارەی بارودۆخی ئابووری زانستی ئابووری و زاراوەی ئابووری.

لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا ڕۆژنامەنووس کۆرسێکی چڕ دەخوێنێ لەبارەی ئابوورییەوە، بۆ ئەوەی ئامادەو شارەزابێت بۆ ئەم جۆرە چاوپێکەوتنانە.

**٤. چاوپێکەوتنی کۆمەڵایەتی:**

ئامانج لەم جۆرە چاوپێکەوتنانە دەستکەوتنی زانیاری تایبەتە بە لایەنی کۆمەڵایەتی، وەك شوکردن و ژنهێنان و پەروەردەو فێرکردن و پەروەردەی منداڵ، هەروەها بایەخ دەدرێ بەو لایەنانەی کە دەبنە کۆسپ لە بەردەم پێشکەوتنی کۆمەڵگادا و یان ئەو داب و نەریتە کۆنەی کە لەگەڵ ئەم چەرخەدا ناگونجێ.

**٥. چاوپێکەوتنی ڕۆشنبیری:**

بابەتە ڕۆشنبیرییە جۆراوجۆرەکان پێویستی بە چاوپێکەوتن لەگەڵ پسپۆڕاندا هەیە لە پێناو ڕوونکردنەوە و پیشاندانی زانیاری بۆ خوێنەر، بۆ نموونە، ڕۆژنامەنووس چاوپێکەوتن ئەنجامدەدا لەگەڵ سەرۆکی ئەدیباندا لە پێناو گفتوگۆکردن لەبارەی یاسای پاراستنی مافی ئەدیبان.

**٦. چاوپێکەوتنی زانستی:**

هەندێ جار ڕۆژنامەنووس چاوپێکەوتن ئەنجامدەدا بە مەبەستی خستنەڕووی زانیاری زانستی لەسەر بابەتێکی دیاریکراو بە خوێنەران وەك بابەتێك لەسەر داهێنانێکی نوێ لە بواری ئامێر یان دەرمان یان ڕێگایەکی زانستی نوێ، جیاکردنەوەی ئەم جۆرە



چاوپێکەوتنە لە وانیتر لەوەدایە کرۆکی ئەم چاوپێکەوتنە زانیاری وردو زانستی لەخۆدەگرێ ڕۆژنامەنووس دوورە لە وەرگرتنی ڕاوبۆچوون.

**٧. چاوپێکەوتنی هونەری:**

هونەر لە هەموو شوێن و کاتێکدا لای خوێنەر بایەخی تایبەتی هەیە لەبەرئەوە ڕۆژنامەنووس لە هەر ڕۆژنامەو گۆڤارێکدا بێت چاوپێکەوتن ئەنجامدەدا لەگەڵ هونەرمەندان یان ئەوانەی پەیوەندییان بە هونەرەوە هەیە لە پێناو پێشکەشکردنی زانیاری و بۆچوونی کەسی بەرامبەر.

**٨. چاوپێکەوتنی وەرزشی:**

خوێنەر بایەخ دەدات بە زانینی هەواڵ و بۆچوون لە بارەی وەرزشوانان بە تایبەت ئەوەی کە پەیوەندی هەیە بە گواستنەوەی یاریزانان لە تیپێکەوە بۆ تیپێکی تر و ئەو کێشانەی کە ڕوودەدات. لەبەرئەو هۆیە ڕۆژنامەنووس چاوپێکەوتن ساز دەدا لە گەڵ یەکێ لە وەرزشوانان بۆ زانینی هەواڵی گواستنەوەی نێوان تیپەکان و زانینی گۆشەنیگا بەرامبەر تیپ و یاریزانان.

**١- ناونیشانی سەرەکی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی:**

دوو جۆر ناونیشان هەیە کە دەتوانرێت لە چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسیدا پشتی پێبەستێن:

١- بەشێك لە وتەی کەسی بەرامبەر دەکەین بە ناونیشان بۆ نموونە: سەرۆکی هەرێمی کوردستان: زۆر پرۆژەی زیندوو هەیە کە هەرێم چاوەڕێیەتی لە ماوەی ساڵانی داهاتوودا.

٢- ڕستەیەکی وەسفی دەکرێت بە ناونیشان: سەرۆکی لیژنەی کۆمسیۆنی دەستپاکی (نزاهە) دۆسیەی گەندەڵی ئیداری دەکاتەوە و هەڕەشەی لێپێچانەوەی توند دەکات.

**٢- ناونیشانی لاوەکی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی:**

لە پێناوی سەرنجڕاکێشانی زیاتری خوێنەران، ڕۆژنامەنووس هەڵدەستێت بە دانانی ناونیشانی لاوەکی و نەخشەساز لە لاپەڕەیەکی ڕۆژنامەکەدا بە خەتێکی گەورەو ڕوون و لە شوێنی گونجاودا، لێرەدا ڕۆژنامەنووس بەشێك لە لێدوانەکان یان زانیاری بایەخدار لای خوێنەر دادەڕێژێت و لەو شوێنە دیارەدا دای دەنێت.

چاوپێکەوتن: ڕێگای کوردستان ژمارە ٢٨٩ لە ١٩٩٨/٢/١٨

**دزینی شوێنەوارەکانمان سڕینەوەی مۆرکی نەتەوایەتیمانە**

سازدانی: شۆڕش

شوێنەوار.....بەشێکی زیندووە لە کلتوورمان و، پێناسی نەتەوەیمانە، شادەماری خۆناسینمانە بە جیهانی دەرەوەی خۆمان و کەلەکە بوونی، تێکۆشان و بەردەوامی ژیان و جێ پەنجەی مێژوویەکی دوور و درێژی بوونمانە، پرسیار لەوەدایە ئایا لەو ئاستەداین کە بتوانین ئەو بەشە گرنگە لە بوونمان بپارێزین و ببینە قەڵغان و قەڵایەکی سەخت لە بەردەم ئەو هەڕەشە گەورانەی کە لێمان دەکرێن، یاخود نەتەوەیەکین تەنها بۆ سڕینەوەی بوونی خۆمان کارمان کردووە.

ئێمە نەتەوەیەکی دەگمەنین لە زۆری دوژمناندا، لە هەموو ڕەنگ و جۆرێك دوژمنمان هەیە، هەر بۆیە کاری بەرگری کردن و تێکۆشان، زۆر بە سەختی ڕێدەکات، جگە لەوەی کە دوژمنەکانمان زۆر وریاو عاقڵانە ئیش بۆ بەردەوامی دوژمنایەتی خۆیان دەکەن و زیاتر لە چەکێك و سەنگەرێکیان لێ گرتووین. توانیویانە بە کرمی ناو خۆمان بمانخۆن، دەستیان خستۆتە ناو خوێن و ئێسك و پرۆسکمان، و دەیانەوێ جینۆسایدی نەتەوەیمان بکەن و پاکتاومان بکەن و لە ناو جوگرافیاو لەسەر نەخشەدا بمان سڕنەوە و لە ناو مێژووشدا ناومان نەهێڵن.

مۆزەخانەی سلێمانی یەکێك لەو شوێنانەیە کە شوێنەوارێکی زۆر بە نرخی تێدا پارێزرابوو، لە سەرەتای ڕاپەڕینەوە دەستەیەك نەتەوەو نیشتمانپەروەرەکان پاراستیان و دەستە دێزو ڕەشەکانیش تالآنیانکرد. ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە ١٤٣٣ ی ڕۆژی ١٩٩٧/٧/٨ و



گۆڤاری گوڵان ژمارە ١٣٢ ی ڕۆژی ١٩٩٧/٨/٢ ئاماژەیان بۆ ئەو بەتاڵانبردنە کردووە، بەڵام تا ئێستا لە ئەنجامی ئەو لێپرسینەوەو لێپێچینەوانەی کراوە تەنها بەڕێوەبەری پێشووی شوێنەوار گیراوەو هیچ ئەنجامێکی بە دەستەوە نەداوە.

بۆ زیاتر ئاگادار بوون لە ترسناکی ئەم دیاردەیەو کارو چالاکییەکانی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری سلێمانی چاومان بە بەڕێوەبەری شوێنەوار بەڕێز (کەمال نوری مەعروف) کەوت کە پسپۆڕە لە بواری شوێنەوار ناسینداو ڕووی پرسیارەکانمان ئاراستە کرد:

* پێش ڕاپەرین ڕژێمی بەعس تێڕوانینی بەرامبەر کلتوورو شوێنەوارەکانمان چی بوو چۆن مامەڵەی لەگەڵ دەکرد؟

& وەکو لای هەمووان ئاشکرایە لەو ڕۆژەوەی جڵەوی فەرمانڕەوایەتی لە عێراق بە دەستەوە گرت واتە لە ساڵی ١٩٦٨ بە دواوەو هەردەم بەرامبەر بە لەنێوبردنی کورد و خاکەکەی درێغی نەکردووە و، بە ئەنفال کردنی ئەو هەزاران کوردەو ڕووخاندنی هەموو گووندو شار و شارۆچکەکانی کوردستان بەڵگەی ڕاستین، لە لایەکی ترەوە ئێمە وەکو شوێنەوارناس ئەوەمان لەو ڕژێمە بۆگەنە دیووە، ئەوەی پەیوەندی بە کەلتوور و شوێنەوار و مێژووی کوردەوە بوو هەموو کات هەوڵی داوە نەیانخاتە ڕوو بۆ ئەوەی ڕاستی شارستانێتی کورد و مێژووەکەی بشارێتەوە، بۆ ئەوەی وا نیشانی بدات ئەو گەلە دوێنی لە دایك بووە و خاوەنی هیچ بنەماو مێژوویەك نییە لەو ڕووەوە، بەڵام کە سەیری ئەو هەموو گرد و تەپۆڵکانە دەکەین لە کوردستاندا ئەو ڕاستییە دەردەکەوێت، کە کورد یەکێکە لەو گەلە دێرینانەی ناوچەکە کە لە گەلانی تری دراوسێ زۆر کۆنترە. بۆیە دوژمنی کورد کەلای ئێمە لە کوردستانی باشوور ڕژێمی بەعسە لە هەموو ئەو بڵاوکراوانەی بڵاوی کردۆتەوە لەسەر مێژوو، شوێنەوار و تەنیا ئەو لایەنەی نیشان داوە کە خزمەت بە ڕەگەزی (سامی و شۆڤێنیێتی عەرەب) بووە.

* دوای ڕاپەرین کە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان ئازاد کراوە، ئێمەی کورد خۆمان تێڕوانینمان چی بووە بەرامبەر کلتوور و شوێنەوارەکانمان چۆن مامەڵەمان لەگەڵ کردووە؟

& بە داخەوە دوای ڕاپەرین ئێمەی کورد نەمان توانی خزمەتی کەلتوورو

شوێنەوارەکانمان بکەین، چونکە عەقلییەتی لێپرسراوانی کورد بۆ ئەوە دروست نەبووە کە بزانێ کەلتوور و شوێنەوار چییە یاوەکو گوزارشت لە چی دەکەن، ئەو بارودۆخەش کە هاتە پێشەوە دوای ڕاپەرین سەرگەردانییەکی گەورەی وای دروست کرد کە لێپرسراوانی ناو حزبەکان خۆیان ببنە قاچاغچی ئاسەوارو لەو دیووی سنوورەوە بە پارەی زۆر بیانفرۆشن. نموونە بۆ ئەمە زۆرە بەڵام دەتوانین باسی یەکێکیان بکەین کە پەیکەرێك هەبوو لە گردی (سەراوی سوبحان ئاغا)ی نزیکی سەید سادق، دزەکان دۆزیانەوەو لەو دیوو سنوور بە پارەیەکی زۆر فرۆشتیان. هەتاکو ئێستا لەگەڵ ئەو هەموو داواکارییانەی هەمانە بۆ خزمەتی شوێنەوارەکانمان جگە لە شتی کەم و ئەوانەی ئاسان دێن بە دەستەوە هیچی ترمان بۆ نەکراوە، من لێرەدا مەبەستم لەونییە رۆڵی بەڕێز وەزیری ڕۆشنبیری کەم بکەمەوە، ئەو بەڕێزە لە هەموو کەسێك بۆ خزمەتی شوێنەوارو ئاسەوارەکانمان دڵسۆزترە زۆر هەوڵی داوەو بەردەوامیش هەوڵ دەدات خزمەت بەو شوێنەوارانە بکرێ، بەڵام لە شوێنی ترەوە ئەو بایەخ پێدانە نەبوو.

* شەڕی ناوخۆ چ کاریگەرییەکی سەلبی لەسەر ئەو بوارە هەبووە و، ئایا نەبووەتە هۆی ئەوەی دەستی تالآنچیان زیاتر ئاوالآ بکا؟

& شەڕی ناوخۆو و فرە حزبایەتی و فرە دەسەڵاتی لە کوردستاندا کۆمەڵێك هۆ بوون، بۆ بە تالآن بردنی شوێنەوارەکانمان ئەو ڕاپۆرتانەی کەلە دەزگاکەمانەوە جارو بار بۆ دەزگا بەرپرسەکان بەرزی دەکەینەوە هەموو ئەو ڕاستیانە دەدەخەن، بەلام ئەگەر جارێك یەکێك لەو دزانە لە لایەن ئەو دەزگایانەوە بگیرێ ئەوا دوای چەند ڕۆژێك یان بە واسیتەی پیاوێکی گەورە بەر ئەدرێ یان ئەوەتا کەفالەتێکی ناوەڕۆك بەتاڵی لێ ئەسێنن دوای بەربوونی کابراش بۆ هەڵکەندن و دزینی ئاسەوارەکان دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی، هەروەکو ئەو دیاردەیەی لە گردی (یاسین تەپەی) ناوچەی تانجەرۆ ڕوویدا. ئەگەر لێپرسراوانی بەڕێزی کورد گەڕانێك بکەن بەناو شوێنەوارەکانی کوردستاندا ئەوسا بۆیان دەردەکەوێت کە دزو جەردەکان ئەوانەی کە هەموو کاریان تەرخانکردووە بۆ نەهێشتنی شوێنەوارەکانی کورد و دزینی ئاسەوارەکانیان چییان بەو مێژووە گەورەیەی کورد کردووە کە خەریکە داری بە سەر بەردییەوە نەمێنێ و گرد



و تەپۆڵکە نەماوە هەڵنەکەندرابێ...ئێمەی لێپرسراو هەر ئەوەندەمان توانیوە کە هەتاکو ئێستا پێویستییەکانمان وامان لێ دەکات، پەلوپۆمان بشکێ و نەتوانین بە کاری پێویست هەڵسین بۆ بەرەنگاربوونەوەی دزەکان. هەموو لایەنێکیش دەزانێت وڵاتی فرە دەسەڵات وا لە مرۆڤ دەکات لە دوا ڕۆژی خۆی ئەمین نەبێ و هەموو کاتێك ترسی لە خۆی هەبێت، دزێك لە دزەکانی شوێنەوار بە فیشەکێك ساردی کاتەوە.

* لە دوای ڕاپەڕین توانیوتانە چەند جێماوەی شوێنەوار بدۆزنەوە؟

& لە دوای ڕاپەڕین لەو کاتەوەی بوومەتە بەڕێوەبەری شوێنەواری سلێمانی لە ١٩٩٧/٦/١ ەوە بە یارمەتی شوێنەوار ناسەکانی تر و پشتگیری گەورەی بەڕێزی وەزیری ڕۆشنبیری توانیومانە ژمارەیەکی چاك شوێنەواری تازە بدۆزینەوە لە وانە گۆڕە هەڵکندراوەکانی ناوچەی بازیان و دەربەندی باسەڕە کە بۆ سەردەمی ساسانییەکان دەگەڕێتەوە، هەروەها گۆڕە هەڵکەندراوەکانی گوندی عامموورەی ناوچەی خورماڵ، کە بۆ هەردوو سەردەمی ئەشکانی و ساسانی دەگەڕێتەوە، جگە لە دۆزینەوەی پەرستگایەکی زەردەشتی لە شاخی سوورێن لە گووندی میری سوور، هەروەها دۆزینەوەی شوێنەواری ئاسنەوەرد لە گوندی بیارە لەگەڵ دۆزینەوەی ئەو شوێنەوارە تازانەشدا توانیمان ناسنامەی نەخشە هەڵکەندراوەکەی دەربەندی باسەڕەش دەربخەین کە بۆ سەردەمی لۆلۆییەکان لە هەزارەی دووەمی پێش زاییندا دەگەڕێتەوە، بۆ زیاتر زانیاریتان ئەو نەخشە هەڵکەندراوە لەوە پێش وا لە سەری نووسراوە کە نەخشێکە پێکهاتووە لە دوو کەس و باوەشیان بە یەکتردا کردووەو هەڵدەپەڕن. لە دۆزینەوەی شوێنەوارە تازەکاندا هەندێك شوێنەواری تازەمان لە شاخی پیرەمەگرون دۆزییەوە لەوانە شوێنەواری میر قولی و رەبەنە کە بۆ سەردەمی ئەشکانییەکان دەگەڕێتەوە. هەروەها دەرخستنی ناسنامەی پەیکەرە هەڵکەندراوەکەی رەبەنەکە، وێنەی پیاوێکی لەسەر هەڵکەندراوە لە ڕووی شاخەکەو دۆزینەوەی پەیکەرەکە بۆ شەهید غەریب هەڵەدنی دەگەڕێتەوە، بەڵام دەرخستنی ناسنامەکەی بۆ ئێمە دەگەڕێتەوە، هەموو ئەو شوێنەوارە تازانەش لە گۆڤارەکەماندا (هەزارمێرد) نووسینم لە سەریان بڵاوکردۆتەوە.

* ئەو شوێنەوارانەی لە لایەن شوێنەوار دزانەوە دەدۆزرێتەوە پێ ناچێ شارەزای لەو بوارەدا لە گەڵ بێ، کە لە دەرەوەی کوردستان هاتبن؟

& بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە دزەکان پێویستیان بە چاو ساغ نییە چونکە کوردن و لەم خاکەدا دەژین لە هەموو کون و قوژبنێکی کوردستان شارەزان و زۆر جاریش لەو دیو سنوورەوە دەستی بێگانە دەگرن بۆ هەڵکەندنی شوێنەوارەکانمان و دزینی ئاسەوارەکانیان. جا ئەو شوێنەوارانە تازە بن یاخود کۆن، دەرگاش بۆ ئەو دزانە لەسەر پشتە، چونکە ئەوانە زیاتر سەر بە حزبە کوردستانییەکانن، و لە ناو ئەواندا کاری خۆیان ئەنجام دەدەن خۆ ئەگەر جاروباریش کەمێك ئاسەواریان پێبگیرێ، ئەوا لە هەزار یەکی ئەو ئاسەوارانە نییە کە ئاودیووی دەکەن. بۆیە دۆزینەوەی شوێنەواری تازە بێ یا نەبێ کاری دزی شوێنەوار هەر بەردەوامە.

*) ئایا ئەو پارچە شوێنەوارانەی لە مۆزەخانەی سلێمانی دزراون چین و بە چەند مەزەندە دەکرێ؟

& گەلێکن ئەو ئاسەوارانەی لە مۆزەخانەی سلێمانی دزراون کە بەنرخترینی هەموویانە، دزینی ئەو ئاسەوارانەش بە هیچ جۆرێك قەرەبوو ناکرێتەوە چونکە هی سەردەمێکن زۆر دەگمەنن لە مێژووی شارستانێتی شیوی نێوان دوو ڕووبارەکە (میزۆپۆتامیا) بۆیە ئەگەر ئەو ئاسەوارە دزراوە بە دەگمەنانە بە پارە بشکێنەوە، ئەوە زیاتر لە دەیان ملێون دۆلار دەگرنەوە. ئێستاش ئەو باسە هەر لە ئاسایش ماوەتەوەو لێپرساوێکی لەسەر گیراوە،بەڵام هەتاکو ئێستا هیچ ئەنجامێکی باشی وای بە دەستەوە نەداوە کە شایانی باسکردن بێت.

*ئایا ڕاستە لە ناوچەکانی سەید سادق و دوکان شوێنەوار دۆزراوەتەوە، زۆر لەو پارچانەی لەو شوێنەوارانەش دۆزراوەتەوە کەوتۆتە دەستی خەڵکی و بە تاڵان براوە؟

& تەنیا شوێنەوارەکانی ناوچەی شارەزوور کە بە گشتی دەستی دزو تاڵان چییەکانی گرتوونییەتیەتەوە، جا ئەو شوێنەوارە تازە بێت یاخود کۆن، زۆرینەی ئەو ئاسەوارانەی دەرهێنراون ئاودیوکراون و بە پارەیەکی زۆر فرۆشراون. بەڵام بۆ ناوچەی دوکان شتێکی وەهام نەبیستووە شایانی باس بێت.

* ئایا شارەزایان لە بواری شوێنەوار چەند دەبن، ئایا لە زانکۆکانی کوردستان بەشێك



هەیە بۆ پێگەیاندنی کادیر لەو بوارەدا ؟

& لە کوردستاندا شارەزایان لە بواری شوێنەوار زۆر کەمن واتە ئەوانەی پسپۆڕن لێرە، لە بەڕێوەبەرێتی شوێنەواری سلێمانی ژمارەیان (٦) کەسن هەندێك لەوانە چوونەتە تەمەنەوە و ئەگەر ئۆغر بفەرمون ئەوا کەمتر دەبنەوە، و کەسی تر نییە شوێنیان بگرێتەوە، پاش (١٠ یان ٢٠) ساڵێکی تر ئەگەر وا بڕوات، پسپۆڕێکی شوێنەواری نامێنێت کە بتوانێ خزمەتی شوێنەوار و شارستانێتی کورد بکات. هەتاکو ئێستاش لە زانکۆکانی کوردستان نەك هەر بەشێك نییە لە بواری شوێنەوار، بەڵکو هەر نازانن شوێنەوار و گرنگییەکەی چیە؟ هەموو ئاسەوار بە شتی ئەنتیکە دێتە بەرچاویان لەوانەی کە بۆ دانانی سەر مێز باشە.....نازانن ئاسەوار و شوێنەوار کەرەسەی گەورەی مێژووی گەلەکەمانن.....بۆیە کردنەوەی بەشێك لەو بوارەدا لە زانکۆکانمان ئەرکێکی نیشتیمانی گەورەیە کەمتر نییە لەو کارەی کە بەعس لە کوردستان ڕاونرا.

* مین زەرەرێکی زۆری بە خەڵکی کوردستان گەیاندووە ئایا قازانجی بە ئێوە نەگەیاندووە، بۆ پاراستنی شوێنەوارەکان لە دەستی چاو چنۆکەکان؟

& ئەو شوێنانەی مین ڕێژکراوە لە کوردستاندا بە زۆری ناوچە شاخاوییەکانی گرتۆتەوە، ئێمەش لەو شوێنانەدا کەمتر شوێنەوارمان هەیە، خۆ ئەگەر ئەو مین ڕێژکردنە لەلایەك قازانجی بەخشیبێت، بەڵام لە لایەکی ترەوە زیانەکەی زۆرتر بووە و هەژاری کوردی داماوتر کردووە.

* ئایا بۆ تا ئێستا، پێشانگای مۆزەخانە نەکراوەتەوە کە خەڵکی بێن بۆ سەیر و بینینی؟

& یەکەم لەبەر ئەوەی ئەو شوێنەوارەی بە نرخ بوو تێیدا دزران و نەما، دووەم لەبەر ئەوەی ناتوانرێ متمانە بە بارودۆخی کوردستان بکەیت، چونکە چەند چەکدارێك بە ڕۆژی نیوەڕۆ بیدەن بە سەریداو تاڵانی بکەن. جگە لەوە بیناکە شێدارەو خراپ بووە پێویستی بە چاککردنەوە هەیە. هەروەها خەزانی شوێنەوارەکان شکێنراون ٢٠٠ تا ٣٠٠ هەزار دیناری تێدەچێ تا چاکی بکەیتەوە.

## سەرەتا

ڕاپرسی ڕۆژنامەنووسی یەکێکە لە هونەرەکانی نووسین و ئامرازێکی خستنەڕووی ڕای گشتیی بۆ خوێنەر سەبارەت بە بابەت و مەسەلە گشتییەکان، ڕۆژنامەنووسی لە جیاتی ئامرازێکی پێناسین بۆ ناساندنی ڕای گشتی بە خوێنەر بەرامبەر باس و بابەتەکان.

ڕاپرسی ڕۆژنامەنووسی یارمەتی حکوومەت دەدات لە ڕێگای خستنەڕووی تەوەرەکانی ڕای گشتی و زانیاری لە سەری و هۆکارەکانی درووستبوونی.

ئەو ڕۆژنامەنووسەی کە ڕاپرسی ئەنجامدەدا پابەندە بە زانینی گرنگترین باسی پێشنیارکراو ئیتر ڕامیاری بێت یان ئابووری یان ڕۆشنبیری و هونەری و وەرزشی..........هتد، نەخشەی بۆ دادەڕێژێ پێش ئەنجامدانی ڕاپرسییەکە ڕۆژنامەنوس بۆ ئەوەی بە سەرکەوتوویی ئەنجامی بدا پێویستی بە دیاریکردنی سامپڵێکە (عینە) کە ڕاپرسیان لەگەڵ بکات بۆ پیشاندانی بۆچوون و ئاراستەکانیان لەسەر ئەو بابەتەی کە خراوەتە بەرباس.

مەرج نییە بۆچوونی ئەو سامپڵە لەگەڵ یان دژ بەو مەسەلەیە بێ کە خراوەتەڕوو، پێویستە بێ لایەنانە و بابەتیانە تێکرای ڕاوبۆچوونە جیاوازەکان بخرێتە ڕوو.

لێپرسراوانی وڵاتانی ڕۆژئاوا بە شێوەیەکی تایبەتی پشت دەبەستن بە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بۆ زانینی کاردانەوەی ڕای گشتی بەرامبەر ڕووداو و کێشەکان. هەروەها زانینی پێداویستییەکانی ڕای گشتی و گەل بە تایبەتی و هەڵوێستیان لە کێشەو ڕووداوە ناوخۆیی و دەرەکییەکان بە بابەتە جۆراوجۆرەکانەوە.

زۆر لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بۆ ڕاپرسی پشت دەبەستن بە وەرگرتنی ڕاوبۆچوونی بەشێکی زۆری هاووڵاتیان و زۆر جار دەگاتە هەزار یان دوو هەزار و ڕێژەی لایەنگیرو بێلایەن دیاریدەکرێت. ڕۆژنامەنووس ژمارەیەکی دیاریکراو لەو کەسانە هەڵدەبژێرێت بۆ پیشاندانی بۆچوونەکانیان لەو بۆچوونانەی کە هێزی لۆژیکی تێدایە.



## پێناسەی ڕاپرسیی ڕۆژنامەنووسی
**Definition of Survey**

دەتوانین بەم شێوەیە پێناسەی ڕاپرسی بکەین:
(هونەرێکی ڕۆژنامەنووسییە ئامانجی پیشاندانی ڕاوبۆچوونی ژمارەیەك خەڵکە لە بارەی بابەتێکی دیاریکراوەوە)
جیاوازی نێوان ڕاپرسی و ڕیپۆرتاژ:

١. ڕاپرسی ڕاوبۆچوونی ژمارەیەك لە هاووڵاتیان کۆدەکاتەوە لە بارەی باسێکەوە کە ڕۆژنامەنووس دەیخاتە بەر باس و لێدوان لە پێناوناساندنی ڕای گشتی بە خوێنەر لە بارەی کێشەیەکەوە، بەڵام لە ڕیپۆرتاژدا ڕۆژنامەنووس لەسەر کێشەیەك دەدوێ کە شایانی مشتومڕە و بۆ دانانی چارەسەربۆی لە ڕێگەی شیکاری و دۆزینەوەی هۆیەکانی تا دەگاتە دانانی چارەسەر.

٢. ڕاپرسی هەمیشە لەسەر بابەتێکی نوێ ئەنجامدەدرێ، بەڵام ڕیپۆرتاژ بابەتەکە نوێ نییە، تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە کێشەکە سەبارەت بە کۆمەڵگا بێت.

٣. لە ڕاپرسیدا گەر ڕۆژنامەنووس بە پلەی یەکەم بۆچوونی هاووڵاتیان تۆمار بکات و بیخاتە ڕوو، ئەوا ڕیپۆرتاژ تەنها ڕاوبۆچوون وەرناگرێت، بەڵکو هەڵدەستێ بە شیکردنەوە بەپشتبەستن بە ژمارەو ئامار و وێنەی ئەوانەی پەیوەندییان بە کێشەکەوە هەیە.

# جۆرەکانی ڕاپرسی
## Kinds of Survey

**١. ڕاپرسیی ڕامیاری:**

گەر بابەتی ڕاپرسییەکە ڕامیاری بوو ئەوا ڕۆژنامەنووس ئەم ئامانجانەی هەیە:

أ- ناساندنی ڕای گشی بە خوێنەر لەسەر مەسەلەیەکی ڕامیاری کە لە ڕاپرسییەکەدا هاتووە و ئاشکراکردنی بیرۆکەو ئاراستەی جیاواز لە بارەیەوە.

ب- ناساندنی بۆچوونی شەقامی ڕامیاری بە حکوومەت ئەمەش دەگونجێ لەگەڵ ئامانجی ڕۆژنامەنووسیدا لەو گۆشەنیگایەوە کە ڕۆژنامە ئاوێنەی کۆمەڵە.

**٢. ڕاپرسیی کێشە و ململانێ:**

ئەم جۆرە ڕاپرسییە ئەو مەسەلە ئاسایشییە نوێیانەی وڵات باس دەکات بەتایبەت لەو وڵاتانەی کە بارودۆخێکی ئاڵۆزی ڕامیاری یان ئاسایشی و قەیرانێکی ئاڵۆزیان هەیە. ڕۆژنامەنووس ڕاپرسییەك ئەنجامدەدات لە بارەی ڕاوبۆچوونی ژمارەیەك لە هاووڵاتیان لەسەر سەقامگیربوونی باری ئاسایش لە وڵاتدا، یان ئەوەی پەیوەندی بە ڕۆڵی پیاوانی پۆلیسەوە لە پاراستنی ئارامی و سەقامگیری هەیە.

**٣. ڕاپرسیی ئابووری:**

ڕۆژنامەنووس لەم جۆرە ڕاپرسییەدا ئامانجی گەیاندنی ڕای هاووڵاتیانە بە داموودەزگا ئابوورییەکان و زۆربەی جار ڕۆژنامەنووس کۆمەڵێك پسپۆڕی بواری ئابووری دیاری دەکات، بۆ گواستنەوەی بۆچوونیان لە بارەی پێشخستنی لایەنێکی دیاریکراوی ژیانی ئابووری.



**٤. ڕاپرسیی کۆمەڵایەتی:**

ئەم جۆرە ڕاپرسییە مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان لەخۆدەگرێ، بۆ نموونە یەکێ لە ڕۆژنامەنووسان ڕاپرسییەکی ئەنجامدا سەبارەت بە چۆنێتی هەڵسوکەوتکردنی باوکان لە کاتی هەڵەکردنی منداڵەکانیان.

**٥. ڕاپرسیی ڕۆشنبیری (ڕووناکبیری):**

ئەم جۆرە ڕاپرسییە بابەتی ڕۆشنبیری پێشنیارکراو لەسەر ئاستی نیشتیمانی یان نێودەوڵەتی لەخۆدەگرێ وەك ڕاپرسی سەبارەت بە دابڕانی ئەدیبان لە ئامادەبوونی کۆڕە و چالاکییە ڕۆشنبیرییەکاندا.

**٦. ڕاپرسیی زانستی:**

لە ڕاپرسی زانستیدا ڕۆژنامەنووس باس لە بابەتێکی زانستی دەکات کە شایەنی مشتومڕبێت لە نێوان ژمارەیەك لە خوێنەران و مەبەستی زانینی ڕاوبۆچونیان و زۆربەی جارئەم جۆرە ڕاپرسییە لە کاتێکدا ئەنجامدەدرێ کە خەوشێك هەبێت لە جموجوڵی بواری زانست لە وڵاتدا.

**٧. ڕاپرسیی هونەری:**

بابەتێکی هونەری باس دەکات بۆ بە ئاگابوونی خوێنەر لێی، وەکو ئەو ڕاپرسییەی کە یەکێ لە ڕۆژنامەنووسەکان ئەنجامیاندا لە بارەی نزمبوونەوەی ئاستی فلیمی سینەمای میسری و ڕۆژنامەنووس ڕاپرسی لەگەڵ ژمارەیەك لە بینەرانی سینەما لە میسر ئەنجامدا.

**٨. ڕاپرسیی وەرزشی:**

بابەتی وەرزش لەخۆدەگرێت بۆ ئاشکراکردنی ڕاوبۆچوونی خوێنەر یان وەرزشوانان تایبەت بە باسی وەرزشی.

# قۆناغەکانی ئەنجامدانی ڕاپرسیی ڕۆژنامەنووسی

**١- هەڵبژاردنی بابەتی ڕاپرسی ڕۆژنامەنووسی:**

بابەتی ڕاپرسی ڕۆژنامەنوسی بەگوێرەی بایەخداری بابەتی رامیاری وئابووری و کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵدا هەڵدەبژێرێت، ڕۆژنامەنوس بڕیاری گرنگی ئەو بابەتە دەدات کە دیاریدەکات بۆ ئەوەی ڕاوبۆچونی هاوولاّتیان لەسەری کۆبکاتەوە. هەندێ جار ڕۆژنامەنووس سامپلێك دیاری دەکات کە پێکدێت لە ١٠٠ هاوولاّتی بۆ زانینی بۆچوونیان کە ئایا دژن یا لایەنگیر ئەو بابەتە دەکەن کە خراوەتە بەرباس، بەلاّم لە کاتی دارشتنەوەی ڕاپرسییەکەدا ئەو بۆچوونانە دەخاتەڕوو کە ڕای کاریگەر و بیانووی بەهێزو بەڵگەی یەکلاکەرەوەیان تێدایە ئیتر دژ یان لەگەڵ بابەتەکە بێت.

**٢- ئەنجامدانی چاوپێکەوتن:**

لە هەنگاوی دووەمدا ڕۆژنامەنووس چاوپێکەوتنەکان لەگەڵ هاوولاّتیاندا ئەنجامدەدا و لە زۆر شوێندا پشت دەبەستێت بە ئامێری تۆمارکردنەوە (تسجیل) وە زۆرجار بۆچوونی سامپلێك لە هاوولاّتیان کۆدەکاتەوە ئەو سامپڵەش دەکرێت بە دووبەشەوە:

**أ- سامپلی هەڕەمەکی:**

ژمارەیەك لە هاوولاّتیان هەڵدەبژێرێت کە ژمارەیان نزیکەی ١٠کەس دەبێت بە شێوەیەکی هەڕەمەکی گەر بابەتەکە شایانی مشتومڕو گفتوگۆی هەمووان بێت یان گشتی بێت بەبێ دیاریکردنی لایەنی پسپۆڕی.

**ب- سامپلی تایبەت یان دیاریکراو:**

لەسەر ڕێنمای سامپلێك هەڵدەبژێرێت کە یەك ڕەگەز یان یەك پیشە یان یەك چین یان لایەنێکی ڕامیاری بێ لە پێناو دەستکەوتنی بیروڕایان. بۆ نموونە چاوپێکەوتن لە گەڵ ژمارەیەك قوتابی لەبارەی پێداویستییەکانی ساڵی نوێی خوێندن.



**٣- قۆناغی دارشتنی ڕاپرسی ڕۆژنامەنووسی:**

لە قۆناغی سێیەمدا ڕۆژنامەنووس هەڵدەستێ بە دارشتنی ڕاپرسییەکە و پێشکەشکردنی لەگەڵ وێنەی ئەو کەسانەی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا سازکردوون بۆ بلاّوکردنەوەی ئەمەش بە شێوازی نووسینی هەرەمی سەرەو ژێرکراو ئامادە دەکات.

## شێوازەکانی نووسینی هونەری ڕاپرسیی ڕۆژنامەنووسی

١. شێوازی چوارچێوەی هەرەمی سەرەوژێرکراو: ئەم شێوازە لە سێ بەش پێکدێت:

أ- پێشەکی ڕاپرسییەکە: لە پێشەکیی ڕاپرسیدا ڕۆژنامەنووس ئەو هۆیانە باس دەکات کە بووە بە هۆی دیاریکردنی بابەتی ڕاپرسییەکە و بایەخەکەی و ئامانجەکەی، بۆ ئەوەی ڕاپرسی بایەخی هەبێ دەبێت بەم شێوەیە بابەت دیاریبکرێت:

١) بایەخداری بابەتەکە لای چینێك یان بەشێك یان جەماوەر.

٢) بایەخی بابەتەکە لای خوێنەر.

هەروەها ڕۆژنامەنووس دەبێت ئەو دەرخستنانە بخاتە ڕوو کە لە بەردەستیدایە لە پێشەکی ڕاپرسییەکەدا دابڕێژێت.




ب- کرۆکی ڕاپرسی ڕۆژنامەنووسی:

لە کرۆکی ڕاپرسیدا ڕۆژنامەنووس بۆ زیاتر.
تێگەیشتنی خوێنەر ئەو چاوپێکەوتنانە دادەڕێژێت کە.
ئەنجامی داوە لە کاتی ڕاپرسیەکەدا لە بەبایەخدارترین بۆچوونەوە بۆ کەمترین بایەخداری و بەم شێوەیە:

أ– بۆچوونی لایەنگیری بابەتەکە.

ب– بۆچوونی دژی بابەتەکە.

ت- بۆچوونی بێلایەن سەبارەت بە بابەتەکە.

ث- کۆتایی ڕاپرسیی.

ڕۆژنامەنووس لە کۆتایی دارشتنەوەی ڕاپرسیدا ڕاوبۆچوونی خۆی باس دەکات بە شێوەیەکی بابەتی و بەبێ ئەوەی لایەنگیری هیچ لایەنێك بکات، چونکە دەستکەوتنی بۆچوونی کەسانی دی یارمەتی ڕۆژنامەنووس دەدات بۆ دروستبوونی ڕاو سەرنج بۆ بابەتی ڕاپرسییەکە، و ڕای خۆی ناخاتە ڕوو، و بەجێیدێڵێ بۆ خوێنەر تا ڕای لا دروست بێت.

## پرسیارەکانی ڕاپرسی

زۆرجار ڕاپرسی بەتەنها پرسیارێك کۆتایی دێت و ئەو کەسانەی کە ڕاپرسیان لەگەڵدا دەکرێت بە گۆشەنیگای خۆیان وەڵام دەدەنەوە.

دووجۆر پرسیار هەیە:

**١. پرسیاری گشتی:**

ئەو پرسیارەیە کە ئاراستەی هەموو هاووڵاتیان دەکرێت و لە گۆشەنیگای جیاوازەوە ڕاپرسیان دەکرێ وەك (ئایا حەز دەکەیت حکومەت دەست لە کار بکێشێتەوە؟ بۆ؟)

**٢. پرسیاری ئامادەکراوی تایبەتمەند:**

ئەم جۆرە پرسیارە ئاراستەی کەسانی تایبەتمەند دەکرێت چونکە هەمووان ناتوانن وەڵامی بدەنەوە وەك: (بەڕای تۆ ستراتیجێتی ئەمریکا لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست چۆنە؟

پرسیاری ئامادەکراوی تایبەت بەو سامپڵە (چاوە) خەڵکەی کە پەیوەندی بە بابەتی ڕاپرسییەکەوە هەیە: پرسیارێك ئامادە دەکرێت بۆ ئەو چاوەیەی کە دیاریکراوە بەهۆی پەیوەندییان بە بابەتی ڕاپرسییەکەوە.



هەنگاوی یەکەم لە ژیانی ڕۆژنامەنووس لای تۆ چی دەگەیەنێ؟

- داقوقی ڕووبەڕووی هاشم دەبێتەوە بۆ ئەنجامدانی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی و سالم هەواڵ کۆدەکاتەوە لە بارەی پڕۆژەی بەربەستەکانەوە. وسام فازڵ لە بارەی سەرتاشخانەکانی بەغداوە دەنووسێ و باوکی سەعد نەزهەت دلێمی لە قەیران ڕزگار دەکات.

- حەمید جاعد مانگرتنێکی گشتی کرێکارانی جێگیرکرد و عەمار تاهیر هەواڵی دەرکەوتنی ناوی خودای لەسەر شانەیەکی هەنگ بڵاوکردەوە.

- سامر ژاوی چاوی بە کەسایەتییەکی ئافرەت کەوت و ئەحمەد عەبدولمەجید یەکەم هەنگاوی لە ڕۆژنامەی برایەتییەوە دەستپێدەکات.

- کەریم سودانی هەڵیان خەڵەتاندووە و زیاو مستەفا لە بارەی جەنبەر فوراتەوە دەنووسێ.

ڕاپرسی / مەحمود محەمەد سالح. /

ڕۆژنامەنووس لە ژیانی ڕۆژنامەنووسیدا دەیان بگرە هەزاران هەواڵ دەنووسێ، بەڵام هەمیشە یەکەم هەواڵی دەستپێکردنی کارەکەی، لەگەڵ دەسەڵاتی چوارەمدا تایبەتمەندی خۆی هەیە، چونکە ئەو هەواڵە دەبێتە پەساپۆرتی پەڕینەوەی و بەسایەی ئەو هەواڵەوە لە خوێنەری ڕۆژنامەوە دەبێتە پیشەوەری ڕۆژنامەگەری. سەرقاڵی وشە و دەستەواژە و ڕستە و پێشدەستی ڕۆژنامەنووسی و چەندین لایەنی تر کە تایبەتە بە ڕۆژنامەنووسییەوە دەبێت چیرۆکی هەواڵ وەك خەونێکی ڕۆژنامەنووسییە، هەموو ڕۆژێك هەوڵ دەدا هەواڵی دەستبکەوێ و هەمیشە لە پێشبڕکێ دایە لەگەڵ کات و دەزگاکانی ڕاگەیاندن بۆ سەرکەوتنی بە وشەی (دەسخۆش) لەلایەن سەرنووسەر یاخود پاداشتێکی ڕۆژنامەنووسی لە ڤیستیڤاڵێکی ڕاگەیاندندا. بۆیە ڕۆژنامەنووسی لەم ڕاپرسییەدا دروستکارانی ئەستێرە ئاشکرا دەکەن، و ئەوانەی ڕۆڵیان هەبووە لە پێشخستنی دەیان لە ڕۆژنامەنووسی لاو بۆ جیهانی ڕۆژنامەگەری و بۆ ناسینی سەرەتاکانی ئەو کەسانە لەگەڵ هەواڵی ڕۆژنامەنووسیدا.

د. حەمید جاعد مامۆستا لە کۆلیژی ڕاگەیاندن دەڵێ : دەربارەی یەکەم هەواڵ کە نووسیوومە بۆ ڕۆژنامەی (الجمهوریە) بووەو ساڵی ١٩٦٤ بە ناونیشانی (قەرز بۆ جووتیاران) بڵاومکردەوە.

هاشم حەسەن و ڕۆژنامەنووسی: سەرەتای د. هاشم حەسەن (مامۆستای نووسینی ڕۆژنامەنووسی لە کۆلێژی ڕاگەیاندن) ئەو کاتە بوو کە د. برایم داقوقی سەرنووسەری ڕۆژنامەی (الصحافە) ساڵی ١٩٧٤ داوای لێکرد کە چاوپێکەوتنێك ساز بکات لەگەڵ یەکێ لە شێوەکاران، بەڵام یەکەم ستوونی ڕۆژنامەنووسی کە بڵاوی کردۆتەوە ڕەخنە بوو لە هەندێ دیاردەی کۆمەڵایەتی.

تاخی و یەکەم هەنگاو : د. ئەحمەد عەبدولمەجید (بەڕێوەبەری نووسین لە ڕۆژنامەی زەمان و مامۆستا لە کۆلێژی ڕاگەیاندن) چیرۆکی هەنگاوی یەکەمی دەگێڕێتەوە لە جیهانی ڕۆژنامەنووسیدا دەڵێ: یەکەم هەواڵ

که بلاومکردەوە لە ڕۆژنامەی تأخی بوو پاشان چەند ڕیپۆرتاژێکم لە ڕۆژنامەی (طریق الشعب) لە سەرەتای حەفتاکاندا و دواتر ژمارەیەك وتاری ڕۆشنبیری لە گۆڤاری (افاق عربیە لە ڕۆژنامەی جمهوریە) بلاوکردەوە.

ئارەزووی نوێ:

د. نەزهەت دلێمی (سەرۆکی بەشی ڕۆژنامەنووسی لە کۆلێژی ڕاگەیاندن) لە بارەی سەرەتاکانییەوە وتی: لە ڕۆژنامەی (اعلام) کە ئەو کاتە سەر بە کۆلێژی ڕاگەیاندن بوو ڕاهێنانمان دەکرد. لە هەمانکاتدا ڕاهێنانم دەکرد لە ئاژانسی هەواڵی عێراقی، جارێکیان بە هۆی ئامادەنبوونی ئامادەکاری هەواڵەوە بەڕێوەبەری گشتی ئاژانسەکە داوای لێکردم من ئامادەی بکەم لەگەڵ ئەوەی من لە قۆناغی یەکەمی کۆلێژ بووم. بەڵام لە بواری تەلەفزیۆن پرۆگرامێکم نووسی لەسەر لاوان بە هۆی دابڕانی ئامادەکاری بەرنامە ئەم کارەم بە هاوکاری د. عەدنان ئەبو سەعد تەواو کرد.

ڕۆژنامەی الام: بەلام د. حەمدان سالم (مامۆستای بابەتی نووسینی ڕۆژنامەنووسی لە کۆلێژی ڕاگەیاندن) دەڵێ: یەکەم هەنگاوی ڕۆژنامەنووسیم بە هەواڵێك دەستی پێکرد لە بارەی پرۆژەی بەربەستەکان کە وەزارەتی (ری) بە نیازبوو لەسەر ڕووباری دیجلە و فورات دروستی بکات هەواڵێکی تر لە بارەی بەربەستەکانی (سد) تورکیا لەسەر ئەم دوو ڕووبارە، هەروەها ڕێنمایی و ئامۆژگاری دەکرا بۆ بە فێرۆنەدانی ئاو ئەم هەواڵانە لە ڕۆژنامەی اعلام بلاوم کردەوە..

هیواو خەون

کاتێك کە یەکەم بابەتی لە ڕۆژنامەی اعلام ساڵی ١٩٨٠ بڵاوکردەوە وایزانی سەرکەوتنێکی بە دەستهێناوە و بلاوکردنەوەی بابەتی تری بە دواداهات بەم شێوەیە د. عەبدولسەلام سامی باسی هەستی خۆی دەکات کاتی یەکەم بابەتی ڕۆژنامەیی بڵاوبۆتەوە کە بریتی بووە لە چاوپێکەوتنێك لەگەڵ کەسایەتییەکی ئافرەت لە پارێزگای بەسرە لەسەر قسەکانی دەڕواو دەڵێ: کۆنترۆڵی خۆمم پێنەکرا لە خۆشیدا کاتێ ناوی خۆمم بینی لە ڕۆژنامە کە ئەمە زۆر هێزی پێدام بۆ بەردەوام بوون لە کاری ڕۆژنامەنووسی.

سەرتاشەکانی بەغداد : سەرتاشەکانی بەغدا ئەوانەی کاری ڕۆژنامەیان لە شەقامی ڕەشیدە و سەرتاشەکانی سەرۆك و پادشاو کەسایەتییە گشتییەکان یەکەمین د. وسام فەزل بوو کە ئێستا (مامۆستای کۆلێژی ڕاگەیاندنە) لەم بارەیەوە دەڵێ: کاتێ کە قوتابی کۆلێژی ڕاگەیاندن بووە لە ڕۆژنامەی اعلام کاری دەکرد

ناوی پەروەردگار یەکەم هەواڵێ د. عەمار تاهیر (سەرۆکی بەشی وەرزشی لە ڕۆژنامەی زەمان ئەویش بەدەر نییە لە سەرسوڕمان کە هەواڵێکی بلاوکردەوە لەسەر دەرکەوتنی ناوی پەروەردگار لەسەر شانەیەکی مێش هەنگ و ئەو کاتە هەواڵەکە لە ڕۆژنامەی اعلام بلاوکرایەوە).



سودانی بوو بە قوربانی گاسن لەو هەڵوێستە دانسقانەی کە ڕۆژنامەنووس کەریم سودانی (نووسەر لە ڕۆژنامەی مەدا) تووشی هات جارێکیان سێ هەواڵی هەبوو، بەڵام لەبەر نەتوانینی هاوڕێکانی بۆ کۆکردنەوەی هەواڵ سەرنووسەر داوای کرد هەواڵەکان دابەش بکات بەسەر ئەو هاوڕێیانەی کە نەیان توانیوە هەواڵ کۆبکەنەوە، بۆ ڕۆژی دواتر ئەو هەواڵانەی داینابوو بۆ هاوڕێکانی بینی بلاوبۆتەوەی، بەڵام ئەو هەواڵەی بۆ خۆی دانابوو بلاونەبۆتەوە بۆیە زۆر دڵتەنگ بوو.

فوراتی بە شێوازی خۆی نارەزایی دەربڕی: سەرەتاکانی زیا مستەفا ئەو چاوپێکەوتنە بوو کە لە گەڵ وێنەگر کەریم فورات ئەنجام درابوو. ئەو وێنەگرە لە بەر دژواری بارودۆخی بژێوی ناچار بوو واز لە وێنەگری بهێنی و بەڵام کۆشکێك لە بەردەم ماڵەکەی خویدا دروست دەکات ئەو کاتە هەواڵەکە لە ڕۆژنامەی اعلام بلاوکراوە.

دارووخانی دیواری کۆنکرێتی: ڕۆژنامەنووس عەلا مستەفا یەکەم هەواڵی لە ڕۆژنامەی اتحاد بلاوکرایەوە کە باسی کەوتنە خوارەوەی پارچەیەك کۆنکرێتی سەر یەکێك لە تانکی ئاوەکانەوە بە سەر خانوویەکی کۆنداو بووە هۆی ڕووخانی خانووەکەو برینی ڕانی سەرۆکی خێزانەکە.

ئاگادارییەك بۆ مێردەکان ڕۆژنامەنووس خەلیل ئیبراهیم یەکەم هەنگاوی لەگەڵ هەواڵێکی سەرنجڕاکێش بوو لە بارەی سزادانێکی سەرنجڕاکێش و دڵتەزێنی پیاوێك لە لایەن ژنەکەیەوە کە خیانەتی لێکردووە سزاکەیشی بریتی بووە لە پرژاندنی ڕۆنی داخکراو بە سەر مێردەکەیدا کاتێك لە خەوێکی قوڵدا بوو ئەم هەواڵە لە ڕۆژنامەی اعلام بلاوبۆتەوە.

قۆرخکردنی کاتژمێرەکان یەکەم هەواڵی ڕۆژنامەنووس محەمەد مەعموری بلاویکردەوە لە بارەی دانانی کاتژمێرێکی گەورە لە یەکێك لە گۆڕەپانەکانی بەغدای پایتەخت بە دوایدا ژمارەیەك هەواڵی تر لەسەر کاتژمێر هاتبوو وای لێهات مەعموری هەواڵی کاتژمێر قۆرخ بکات.

**نموونەیەکی ڕاپرسی.**

# ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسی(*)

### سەرەتا

کاری ڕۆرژنامەنووسی بە هۆی هونەری ڕیپۆرتاژەوە گەیشتە ئاستی چاودێرێکردنی دەزگاکانی دیکەی کۆمەڵگاو دەستنیشانکردنی کەموکوڕییەکان و خستنە بەرچاوی ئەو کێشانەی کە کۆمەڵگا پێوەی دەناڵێنێ بە هەموو جۆرەکانییەوە ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و زانستی و هونەری و وەرزشی. لە پێناوی ئەمەدا ڕۆژنامەو گۆڤارەکان لاپەڕەی تایبەت و جێگیر بۆ ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسی تەرخان دەکەن.

ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسی تیشك دەخاتە سەر کێشە بڵاوەکانی ناو کۆمەڵگا و ئاشکراکردنی هۆیەکانی و ئاراستەکانی هەتاوەکو گەیشتن بە چۆنیەتی چارەسەرکردنی، بە پێشنیازکردنی ئەو ڕاسپارانەی کە ڕۆژنامەنوس بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان بە گونجاوی دەزانێ، لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە زۆر لە ڕۆژنامەنووسان شارەزای نووسینی ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسی بوون بە تایبەت لە وڵاتە ڕۆژئاواییە کراوەکاندا لەسەر سەرچاوەی زانیاری بە شێوەیەك کە چارەسەرییەکان لە لایەن ڕۆژنامەنووسانەوە ڕووندەکرێتەوە و زۆر لە دەزگاکانی کۆمەڵگا پێشنیازو ڕاسپاردەکانی ڕۆژنامەنووسان لە هەموو بوارەکاندا بە هەند وەردەگرن. چەمکی دەسەڵاتی چوارەم زۆر بەڕوونی لەگەڵ هونەری ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسیدا دەردەکەوێت.

---

(*) لە ڕێنووسە عەرەبییەکەدا نووسەر ڕیپۆرتاژی بە تحقیق داناوە واتا بەدواداچوون بۆ reportage ی ئینگلیزی و من لە ئینگلیزییەکەوە وەرمگرت چونکە جیاوازی هەیە لە نێوان ریپۆرتاژ و بە دواداچووندا هەرچەندە نووسەر لە باسەکەیدا مەبەستی ریپۆرتاژ و بەدواداچوون هەردووکیانە (وەرگێڕ)



بە گوێرەی ئەم چەمکە کاری ڕۆژنامەنووسی تەنها بریتی نییە لە گواستنەوەی ڕووداو بۆچوون و فرە زانیاری بەڵکو گوزارشت لە ڕۆڵی چاودێر دەکا بە سەر دام و دەزگاکاندا ولەو کێشانەی کە دروست دەبێت و دانانی چارەسەر بۆی سەرەڕای ناساندنی خوێنەر بەوەی کە خەوش لە کرۆکی کۆمەڵگا هەموویدایە. لەبەرئەوە گۆڤار و ڕۆژنامەکان بایەخ دەدەن بە لاپەڕەکانی ڕیپۆرتاژ و بە لاپەڕەیەك لە لاپەڕەکانی وروژاندن و زیندوێتی و سەرگەرمی دەژمێردرێت لە بەر ئەوە ڕۆژنامەنوسان تایبەتمەندی شارەزابوونیان بە ئەنجامدانی ڕیپۆرتاژە نەك لە ماوەی نووسین و داڕشتنی ڕیپۆرتاژدا بەڵکو شارەزای هونەری لێکۆڵینەوە لە ڕاستییەکان و ئەنجامدانی چاوپێکەوتن و لێکۆلینەوە لە سەرچاوەی زانیارییەکان.

## پێناسەی ڕیپۆرتاژ
## Definition of Reportage

ئەتوانین پێناسەی ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسی بکەین بە: (هونەرێکی ڕۆژنامەنووسییە کە زانیاری و ڕاوبۆچوون لە بارەی کێشەیەکی دیاریکراوەوە کۆدەکاتەوە بە مەبەستی دانانی چارەسەری گونجاو بۆی).

هەروەها پێناسە دەکرێت بە:

(هونەرێکی ڕۆژنامەنووسییە، ڕۆژنامەنووسی شارەزا ئەنجامی دەدا بە مەبەستی ئاشکراکردنی لایەنەکانی یەکێ لە کێشەکان و سەرنجڕاکێشانی ڕای گشتی سەبارەت بەو کێشەیە).

## قۆناغەکانی ئەنجامدانی ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسی

**١. قۆناغی دیاریکردنی بیرۆکەی ڕیپۆرتاژ و کۆکردنەوەی دەرخستەکان:**

لە قۆناغی یەکەمدا ڕۆژنامەنووس هەڵدەستی بە کۆکردنەوەی دەرخستە و زانیاری و بۆچوونەکان لە بەڵگەو سەرچاوە پەیوەندیدارەکان بە بابەتەکەوە بۆ نیشاندانی پێشینەی کێشەکە بە خوێنەر و کاریگەرە نێگەتیڤەکانی لەسەر کۆمەڵگا بۆ نموونە ئەگەر بابەتی ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسی لە بارەی (نزمبوونەوەی ڕێژەی دەرچوون لە یەکێ لە قوتابخانەکاندا). یەکەمجار زانیاری لە بارەی ئەو قوتابخانەیە و ڕێژەی دەرچوون لە ماوەی ساڵانی ڕابردوودا و ژمارەی قوتابی و وانەبێژ و ئەو پرۆگرامانەی کە پشتیان پێبەستووە و زمانی وانەووتنەوە کۆ دەکرێتەوە، هەروەها ڕۆژنامەنووس ئەو لایەنانە دیاری دەکات کە گفتوگۆیان لەگەڵ دەکات لە بارەی بابەتەکەوە وەك وانەبێژ و لێپرسراوانی قوتابیان و قوتابیان خۆیان و بەرپرسێکی بەرێوەبەرێتی پەروەردە.

**٢. قۆناغی ئەنجامدانی چاوپێکەوتن لەگەڵ لایەنە پەیوەندیدارەکاندا:**

پاش کۆکردنەوەی دەرخستەکان و دیاریکردنی لایەنی ڕیپۆرتاژەکە. ڕۆژنامەنووس هەڵدەستی بە ئەنجامدانی چاوپێکەوتن لەگەڵ لایەنە پەیوەندیدارەکاندا بۆ دەستکەوتنی بۆچوونیان و دڵنیابوون لەو زانیارییانەی کە دەستی کەوتووە، بەڵام دەبێت ئاگاداری هەندێ کاروبار بین:

أ- ئەو لایەنانەی ئاخاوتنیان لەگەڵ دەکەین بەتەواوی ئاگاداری کێشەکە بن و زانیاری بە سوود بدەن.

ب- پێویستە کێشەکە لەناو ئەو لایەنانەدا بێت و بتوانرێ زانیاری لە بارەوە پێشکەش بکرێ و چارەسەری پێویستی بۆ بدۆزرێتەوە.

ت- دڵنیا بێت لە ئامادەیی ئەو لایەنانە بۆ ئاخاوتن لە بارەی کێشەکەوە.

پ- دیاریکردنی کاتی پێشوەختی چاوپێکەوتن لەگەڵ لایەنەکاندا.

پاشان ڕۆژنامەنووس لەگەڵ لایەنە پەیوەندیدارەکان چاوپێکەوتن ساز دەکات لەسەر چەند بنەمایەك:



أ- جێگیرکردنی چاوپێکەوتنەکان لە ڕێگەی تۆمارکردنیان بە ئامێری تۆمارکردن (تسجیل).

ب- تەنها گفتوگۆ نەبێت بەڵکو هەوڵی دەستکەوتنی بەڵگەی پێویست بدەیت.

ت- دڵنیابوون لەو کەسانەی کە چاوپێکەوتنیان لەگەڵ دەکرێ بە شێوەیەك لە شێوەکان پەیوەندیدار بن بە بابەتی ڕیپۆرتاژەکەوە.

**٣. قۆناغی دارشتنی ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسی:**

لەم قۆناغەدا ڕۆژنامەنووس هەڵدەستی بە دارشتنی ڕیپۆرتاژەکە بە شێوازێك لە شێوازەکانی نووسینی ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسی و بەپشتبەستن بە:

أ- بەڵگە ئەگەر هەبێت.

ب- وێنەو دەرخستەی ڕوونکردنەوە.

ڕۆژنامەنووس پشت دەبەستێ بەو بەڵگانە بۆ سەلماندنی بابەتەکەی و قەناعەت پێکردنی خوێنەر بە گرنگی کێشەکە و قایلکردنی بەرپرسان بۆ دانانی ڕێگەچارە بۆ کێشەکە.

## شێوازەکانی نووسینی ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسی

**١. شێوازی چوارچێوەی هەرەمی ڕێك (چیرۆك —Story):**

ئەم شێوازە لە چیرۆك دەچێت. ڕۆژنامەنووس لە نووسینی ڕیپۆرتاژدا بە باسێکی ورد سەبارەت بە هۆی دروستبوونی کێشەکە و دواتریش دەچێتە ناو مەسەلە وردەکارییەکانەوە تا دەگاتە دانانی چارەسەری گونجاو بۆ کێشەکە. ئەم شێوازەش دەکرێت بە سێ بەشەوە:

أ- پێشەکی:

پێشەکی ڕیپۆرتاژەکە لە شێوەی چیرۆك دەخاتەڕوو بە گێڕانەوەی لایەنێکی کێشەکە کە ڕیپۆرتاژی لە مەڕ دەکات و شێوەی پرسیار و وەڵام (پرس و ڕا) لە نێوان دووکەس

یان چەند کەسانێك دەستپێدەکات و لە کاتی گێڕانەوەکەدا ئاماژە بە بەرەنجامی ئەو نارەحەتیانە دەکات کە کەسانی تر تووشی دەبن گەر کێشەکە گەورەبێتەوە.

ب- کرۆکی ڕیپۆرتاژ :

لە کرۆکی ڕیپۆرتاژدا ڕۆژنامەنووس گۆشەنیگا جیاوازەکان دەخاتەڕوو کە زۆر جار دژی یەکترن لەگەڵ لە بەرچاوگرتنی ئەم خاڵانەدا:

١) لایەنگیری نەکردنی هیچ لایەنێك.

٢) خستنە ڕووی بۆچوونەکان وەك خۆی بێ کەم و زیاد.

٣) دڵنیابوون لەو بیانووانەی کە کەسەکان دەیگێڕنەوە لە کاتی دیدارەکەدا.

ت- کۆتایی ڕیپۆرتاژ:

لە کۆتایی ڕیپۆرتاژدا چارەسەر دەخرێتەڕوو و پێشنیاز دەکرێت بۆ بەردەم لێپرسراوان. هەروەها نووسینی بۆچوونی خودی نووسەر لەسەر چۆنیەتی لە ئەستۆگرتنی کێشەکە و دانانی چارەسەری پێویست بۆی.




**٢. شێوازی چوارچێوەی هەرەمی سەرەوژێرکراو:**

لەم شێوازە نووسینەدا ڕۆژنامەنووس چارەسەری پێویست پێشنیاز دەکات پێش ئەوەی بچێتە ناو هۆیەکانی سەرهەڵدانی کێشەکە و پیشاندانی دەرخستەکان، لەگەڵ ئەوەی



ئەم شێوازە کەم بەکاردێت ئەوا لەکاتی پێشنیازکردنی کێشە ناسراوەکاندا بە کاردێت. کە خەڵك کە زانیاری تەواوی هەیە لە مەڕ چۆنیەتی سەرهەڵدانی کێشەکە.

بۆ نموونە: ڕۆژنامەنووس کێشەی (بڵاوبوونەوەی دیاردەی قۆپیێ لە ناو قوتابیانی کۆلێژەکاندا) دەخاتەڕوو و هەڵدەستی بە ئەنجامدانی چاوپێکەوتن لەگەڵ ژمارەیەك لە قوتابیان بۆ زانینی ئەو مەسەلانەی بۆ قۆپیەکردن هانیان دەدات سەرەڕای چاوپێکەوتن لەگەڵ ژمارەیەك لە مامۆستایانی زانکۆ و تایبەتمەندی کۆمەڵناسی و دەروونناسی بۆ زانینی پاڵپێوەنەری کۆمەڵایەتی و دەروونییەکان لە پشت دیاردەکەوە. دواتر چاوپێکەوتن لەگەڵ وەزیری خوێندنی باڵا یان سەرۆکی یەکێ لە زانکۆکان بۆ زانینی ئەو سزادانەی کە سنوورێك دابنێ بۆ دیاردەی قۆپیەکردن.

ئەم شێوازەش دەکرێت بە سێبەشەوە:

أ- پێشەکی:

کورتەیەك دەخاتەڕوو لە بارەی ئەو کێشەیەی کە گەورە بووە لە ناو کۆمەڵگادا و چۆنیەتی پەرەپێدان و کاریگەریی لەسەر کۆمەڵ ئەویش لە ڕێی خستنەڕووی زانیاری دەستکەوتوو لەسەر کێشەکە و بارودۆخی پەرەپێدانی.

ب- کرۆك

بۆچوونەکان لەسەر کێشەکە دەخرێتەڕوو بە ئەنجامدانی چاوپێکەوتن لەگەڵ پسپۆڕانی ئەو بوارەدا یان زیان لێکەوتووانی ئەو کێشەیە.

ت- کۆتایی

خستنەڕووی ئەنجام و چارەسەر، ئەم چارەسەرانە دەخاتە بەردەم بەرپرسان و تایبەتمەندان و پەیوەندیداران بە چارەسەری کێشەکە.




## جۆرەکانی ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسی

**١. ڕیپۆرتاژی ڕامیاری:**

ئەو بابەتانە دەگرێتەخۆ کە پەیوەندییان بە باری ڕامیارییەوە هەیە وەك بابەتی (گەندەڵیی ڕامیاری و ساختەکردنی هەڵبژاردنەکان و باسی دەسەڵاتە سیاسییەکان لە وڵاتدا وەك دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردن...هتد).

**٢. ڕیپۆرتاژی کێشە و ململانێ:**

کێشە ئاسایشییەکان دەگرێتەخۆ، ئەوەی لە وڵاتدایە وەك تیرۆرکردن و مەسەلەی تیرۆریستان ئەو هەڕەشانەی کە ڕووبەڕووی کۆمەڵگا دەبێتەوە لە کاتی گەورەبوونی ئاڵۆزی بارودۆخی ئارامی و ئاسایشیدا.

**٣. ڕیپۆرتاژی ئابووری:**

ئەو باسانە دەگرێتە خۆ کە پەیوەندی هەیە بە باری ئابووری و دارای و بازرگانی و بازاڕی دراومەنی و گەندەڵیی ئابووری و ئەو زیانانەی کە تووشی کۆمپانیا ئابوورییەکان دەبێتەوە لە ئاکامی قەیرانە ئابوورییەکان.



**٤. ڕیپۆرتاژی کۆمەڵایەتی:**

باس لە کێشە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵگا دەکات پاش ئەوەی دەبێتە دیاردەیەك و شایانی ڕیپۆرتاژە وەك تەلاق (جیابوونەوە) و زەماوەندکردنی بە تەمەنەکان لەگەڵ کچە منداڵەکاندا یان دیاردەی جگەرەکێشان لە ناو منداڵاندا و هەڵهاتنی منداڵان لە ئەرکەکانی قوتابخانە یاخود هۆگربوونی منداڵ بە بەرنامەکانی تەلەفزیۆن.

**٥. ڕیپۆرتاژی ڕۆشنبیری:**

ئەنجامدانی ئەم جۆرە ڕیپۆرتاژە لە پێناوی تیشك خستنە سەر کێشە ڕۆشنبیرییەکان و پێشکەشکردنی چارەسەری گونجاو بۆیان. نموونەی ئەم کێشانە (دزینی ئەدەبی کە ڕوودەدات لە نێوان نوسەران و شاعیراندا یان هۆی دوورکەوتنەوەی خوێنەران لە پەرتووکە ئەدەبییەکان).

**٦. ڕیپۆرتاژی زانستی:**

باس لە مەسەلە زانستییەکان و ئەو کێشانەی کە تووشی دەبێ دەکات وەکو نزمبوونەوەی ئاستی خوێندن لای قوتابیانی یەکێ لە قوتابخانەکان. ڕۆژنامەنووس هەوڵی دەستکەوتنی دەرخستە دەدات لە بارەی قوتابیان لەو قوتابخانەیەو لە ساڵانی ڕابردوودا و هۆی نزمبوونەوەی ئاستیان تا دیاریکردنی و دانانی چارەسەری پێویست، دەخاتە ڕوو.

**٧. ڕیپۆرتاژی هونەری:**

لەو کێشانە دەکۆڵێتەوە کە پەیوەندی هەیە بە بوارە هونەرییەکانەوە وەك گۆرانی و شێوەکاری و مۆسیقا و شانۆ و سینەما و تەلەفزیۆن، بۆ دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو بۆی، بۆ نموونە: (دیاردەی گرتنەخۆی کەسانی ناپسپۆڕ بۆ ناو جیهانی هونەر یان لاوازی کاری سینەمایی).

**٨. ڕیپۆرتاژی وەرزشی:**

ئەم جۆرە ڕیپۆرتاژە باس لەو کێشانە دەکات کە لە ناوەندە وەرزشییەکاندا ڕوودەدات وەك دیاردەیی خراپبوونی ئاستی تیپەکان یان بایەخ پێنەدان و یاری شەترەنج و خواردنی مادەی چالاکیی و ووزە بەخشین لە لایەن وەرزشوانانەوە.

## چەشنەکانی ڕیپۆرتاژ

**١. ڕیپۆرتاژی درێژەپێدراو (فراوان):**

ڕۆژنامەنووس ئەو کاتەی کە بە بەڵگە و چاوپێکەوتنەکان پشت ئەستوور بێت بەشێوەیەکی فراوان ڕاوبۆچوونی لایەنی جیاواز دەربارەی باسە پێشنیازکراوەکە دەخاتە ڕوو پاشان ئەو ڕاستیانە دەستیکەوتووە دەخاتە ڕوو تا دەگاتە سنووری چارەسەرێکی لۆژیکیانە بۆی.

**٢. ڕیپۆرتاژی وێناکراو:**

جاروبار ڕۆژنامەنووس ناچار دەبێت پشت ببەستێ بە وێنە وەکو بەشێکی بایەخدار لە بەدواداچوونەکەیدا لە بەر ئەوە هەڵدەستی بە دەستکەوتنی وێنە و دواتر هەڵدەستی بە کۆکردنەوەی بۆچوونەکان کە وێنەکان پاساوی بۆ دەدەن تا دەگاتە ناسینی هۆی کێشەکە.

بۆ نموونە: ڕۆژنامەنووس ڕیپۆرتاژێك دەنووسێت لە بارەی ئەشکەنجەدانی ئەوانەی لە زینداندان، ئەویش بە پیشاندانی وێنە کە دەبێتە بەڵگە لە پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ و ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان، بەڵام تەنها بە وێنە بڵاوکردنەوە نابێ بەڵکو دیداری یەکێ لە بەرپرسانی زیندانەکان و بەرپرسێکی وەزارەتی ناوخۆ بۆ زانینی ڕای بەرپرسانی حکوومەت لە بارەی ئەم پێشێلکردنە.



وێنە بە لایەنێکی زۆر بایەخدار لە لایەن خوێنەرانەوە دادەنرێت بە تایبەت ئەمڕۆ وێنە بەڵگەی سەلماندنەو پێویستی بە سەلماندنەوەوە نییە. زۆر لەم وێنانە وەك چەقۆی سەر ملی بەرپرسان وایە. ئەم جۆرە ڕیپۆرتاژە چەندین شێوازی هەیە وەك:

أ- ڕیپۆرتاژی پیشاندانی کێشەکان:

ئەم جۆرە ڕیپۆرتاژە ئامانجی خستنەڕووی کێشە باسلێکراوەکانە لە هەموو ڕوویەکەوە و ئەو هۆکارانەی بوونەتە پەرەسەندنی گۆمەڵگادا یاخود لە ئاستی پیشە یان بەشێکی دیاریکراودا نووسەر بەردەوام دەبێت تا دانانی چارەسەری گونجاو بۆی لە چوارچیوەی بەرنامەیەکی دیاریکراودا لە لایەن پەیوەندیدارانەوە.

ب- ڕیپۆرتاژی ناکاوەکان:

ئەم جۆرە ڕیپۆرتاژە ئامانجی ئاشکراکردنی کێشە نادیارەکانە لە کۆمەڵگادا، زۆرجار تاکەکانی کۆمەڵ بێئاگان لێی وەکو بەکارهێنانی توندوتیژی دژی منداڵ و ڕووداوی ئەوانەی لانەی هەتیواندا دەژین، بە شێوەیەك کە لە ناکاوە لای کۆمەڵگا بە بەشێك لە کێشەی خۆی دەزانی وە ئارەزووی زانینی زانیاری فرە دەکات.

ت- ڕیپۆرتاژی توێژینەوەو پشکنین:

هەندێ کێشە هەیە لە ناو کۆمەڵگادا هەستپێکردنیان ئاسانە، بەڵام هەندێ کێشە هەیە پێویستی بە پشکنینی زیاتر هەیە، ڕۆژنامەنووس بە دوای شوێنەواریدا دەگەڕێ بۆ ئەوەی تیشك بخاتە سەر لایەنە جیاوازەکانی و ئاشکرای بکات.

**ریپۆرتاژ / ڕێگای کوردستان ژمارە ٥١٩ ی ٩ /٩ /٢٠٠٢**

> **گەڕەکی سارداو داوای تۆڕی ئاوی خواردنەوە دەکەن بۆ گەڕەکەکەیان**
>
> ڕیپۆرتاژ / گۆران سدیق، ڕەحمان غەریب
>
> هەر لەگەڵ چوونە ناو گەڕەکی سارداو ئیتر دیمەنی ژنی تەنەکە لە سەرشان و کاروانی ئەو منداڵە دەبینێ کە وەك بڵێی ئولفەتیان لەگەڵ دەبەو مەتارەو سەتڵی ئاودا گرتبێ.....گەڕەکێك کە ناونراوە ڕازاوە و هیچ ڕازاوەییەك نابینرێ جگە لە کاروانی ژن و منالّی سەتل بە دەست.
>
> ❊ کاك مارف عەلی محێدین هەرکە زانی ڕۆژنامەنووسین پاش بەخێرهاتن ڕووی تێکردین و

گووتی: لەوەتەی ئەم گەڕەکە دروست بووە ئەم بێ ئاوییە هەر هەبووەو لە ڕێی بەرنامەی تەنکەرینی بەڕێوەبەرایەتی ئاوەوە، بە تەنکەر ئاومان بۆ دابین دەکرێت، جاری وا هەیە لە هەفتەیەکدا یەکجار سەرەمان بەرناکەوێ لەبەر ئەوەی (٤٠٠ — ٥٠٠) ماڵە، سەرەڕای کێشەی بێ ئاوی کێشەی کارەباشمان هەیە، ئەوەی ناوی گلۆپی شیری بێت نیمانە چونکە کارەباکەمان لاوازە و گلۆپی خڕ بەکار دەهێنین، محاویلەکە لێمان دوورە، هەندێکمان بە بڕی (١٠٠٠) دینار وایەری کڕیوە، ئێمە شەقامی قیرتاوکراومان ناوێ چونکە ئێمە گەڕەکێکی هەژارین، هەژاران نابێ بەسەر شەقامی قیرتاوکراودا بڕۆن تەنها کێشەی ئاو و کارەبامان بۆ چارەسەر بکەن.

* ڕازاو کەریم دەڵێ: ئێمە ڕۆژانە لە ماڵەکانی خوارەوە کە بیریان هەیە ئاو دەهێنین وەزعێکی زۆر خراپمان هەیە، بە چاوی خۆمان دەبینین خەتی کارەباکان لە داوی جاڵجاڵۆکە دەچێ، پێویستی بە عەمود هەیە تا وایەرەکانی پیا هەڵواسرێ، ئێمە داوای قوتابخانەی تازە و شەقام و تەنانەت ئاوەڕۆشمان نەکردووە، خەمی ئێمە ئاوە و کارەبایە کە دەڵێی چرایە دەسوتێ

* سەبریە ڕەشید سەرەڕای گەورەیی تەمەنی، بەڵام ئەو کێشانە ڕۆژانە ماندووی دەکات: ئەوەی بیری هەیە باشترە، زۆر بێ ئاوین تەماشای منداڵەکانمان بکە چەند بێنازن لەو تەپوتۆزەی گەڕەك، سەرەڕای ئەمەش دەگەڕێنەوە ماڵەوە لەبەر ئەوەی زۆربەی ڕۆژەکان ئاو نییە ئاوی تەنکەرەکە بەشمان ناکات، ناشۆرێن هەروەها باوکیشیان کەلە کرێکاری دێتەوە ئاو نییە ئەمە کەی حاڵە دەڵێی بیابانە.

* ئامینە مستەفا گووتی: وەزعی گەڕەکەکە دەبینین خانوویەکمان گرتووە بۆ منداڵەکان تیایدا بخوێنن، ئاوەڕۆی گەڕەکەکە بە دەرەوەیە کارەباکەمان زەعیفە، خەستەخانە دوورە دەستە ئێمە سەرەڕای نەبوونی هەموو ئەمانە کێشەی ئاومان هەیە داوا دەکەین فریامان بکەون، هەرجارێ کە داواشمان کردووە دەڵێن لە بەرنامەدایە.

* دیمەن ئەحمەد: ئێمە سێ ساڵە خانوومان لە گەڕەکی سارداو دروست کردووە بە شێوەیەکی یاسایی، بەڵام ئەم گەڕەکە ئاوڕی لی نادرێتەوە نازانین بۆ؟ مەکتەبمان نییە، خەستەخانەمان نییە و شەقامەکان خۆڵن، ئاوەڕۆی گەڕەکەکەمان منداڵان یاری تێدا دەکەن، سەرەڕاش ئاو نەبێ ئیتر ژیان دەبێت لەم گەڕەکە چۆن بێ؟

* هەموو ئەو بەرێزانەی لەم گەڕەکە پێشوازییان لێکردین هەمان خەم و داواکارییان بەرزکردەوە بۆ بەرپرسانی بەشەکانی شارەوانی سلێمانی لەو نێوەندەدا، کۆمەڵێ منداڵ بە ڕوومان هاتن لێمان پرسین: لە کوێوە ئەو ئاوە دەهێنن؟ هەموو پێکەوە وەڵامیان دایەوە کە زۆر دوورە لە ناو ئەو منداڵانە یەکێکیان وتی: هەموو ڕۆژێ ئێمە بە دەبەو سەتڵ ئاو دەهێنین بۆ ئەوەی دایکم هیلاك نەبێ، ئێمە زۆر جار هەست بە ماندووبوون دەکەین، بەڵام چی بکەین ئاخر ئەی ماڵەوە ئاویان ئەوێ، من ڕۆژی شەش



کاروان ئاو دەهێنم.

ئیدی وەك هاووڵاتیانی ئەو گەڕەکە ئاماژەیان بۆ کرد پێداویستی سەرەکییان ئاوی خواردنەوەیە بۆیە ڕوومان کردە بەشی ئاو لە شارەوانی سلێمانی چاومان کەوت بە

* ئەندازیار (ئاسۆ جەزا ئەحمەد صالح) ڕاستەخۆ لێمان پرسی: گەڕەکی سارداو بێ بەشە لە تۆڕەکانی ئاوی خواردنەوە، ئێوە نیازتان چییە بۆیان بکەن؟

& گەڕەکی سارداو گەڕەکێکی تازەیە کێشەی زیادەڕەوی تیایە، ئێمە تاوەکو ناوچەیەك نەخشەی بنەڕەتی نەبێت ناتوانین هێڵی ئاوی بۆ ڕابکێشین چونکە شەقام و کۆڵانەکان تحدید نەکراون کە تاپۆ نەکرابوو، بەڵام ئێستا کە خانووەکانیان بۆ تەملیك کردوون شەقام و کۆڵانەکانی تحدیدکراون دەستمان کردووە بە مەسحێك بۆ ئامادەکردنی کەشفێکی موتەکامیل بۆ دابینکردنی ئاوی خواردنەوە بۆ ئەو ماڵانەی وەك چۆن کێشەکانی زەرگەتەی کۆن و زێڕینۆکمان چارەسەر کرد.

* ئێمە کە دەڵێین قۆناغی کەشف، ئایا لە پێش قۆناغی گەیشتنی ئاوە بەم گەڕەکە؟

& قۆناغی کەشف ئەوەی لەسەر ئێمەیە پێشکەشکردنێتی بە ڕێکخراوەکان، جێبەجێ کردنی دەکەوێتە ئەستۆی هەندێك لە ڕێکخراوەکان بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی ئەو پڕۆژەیە یان لە بودجەی شارەوانی دەیکەین.

* گەڕەکی سارداو چەند تۆڕی ئاوی دەوێ؟

& ئێمە جارێ لە قیاساتی بەرزی و نزمی گەڕەکەکەین پاشان تەسمیمی گونجاوی بۆ دادەنێین ئەوە دوو هەفتەیە ئەم کەشفە دەستی پێکردووە.

* لەگەڵ نەبوونی ئاو بەرنامەی تەنکەرینی ئێوە کەموکوڕی تیایە؟

& ئێمە بۆ بەرنامەی تەنکەرین پار (١٥) تەنکەرمان لە بەردەستدا بوو، ئێستا (٦) تەنکەر لەو بەشە هەیە زۆر زۆر کەمە، بۆ نموونە ئەگەر هەر ٦ تەنکەرەکە، بەرین بۆ گەڕەکێکی وەك سارداو جارێ کەمە، ئەو تەنکەرانە کە هیوادارین لە فەیسەکانی داهاتوو تەنکەری ترمان بۆ دابین بکرێ، ئێستا هەندێ ناوچە هەیە واخەریکە بە کاملی دێتە سەر شارەوانی سلێمانی، دابینکردنی ئاو ئەرکی ئێمەیە، ئەمە جگە لەو زەوییانەی دابەش دەکرێت و دەکرێن بە خانوو بۆیە ئێمە ژمارەیەکی زۆرتر تەنکەرمان ئەوێ.

* هەندێ بیریان سەتحین ئەو بیرانە سەرنجتان ڕاناکێشێ بۆ ئاستی بەرزی ونزمی ئاو لە گەڕەکەکە؟

& ئەو بیرانە سەتحین، ئێمە لەو ناوچەیە چەند بیرێکی ئیرتیوازیمان لێدا، بیری ئیرتیوازی مەسحی جیولۆجی دەوێ، تا ڕادەیەك سەرکەوتوو بووین، ئێستاش وەك سەرەتا ئاماژەم پێکرد کە ئامادەکردنی کەشفی ئەو گەڕەکەین تا داهاتوو تۆڕی ئاوی خواردنەوەیان پێبگات.

## سەرەتا

وتار بە کۆنترین هونەری ڕۆژنامەنووسی دادەنرێت لە سەرەتادا وتار بەم شێوەیەی ئێستا هەیە نەبووە کە (پڕە لە وروژاندن و بیرۆکە و بۆچوونی لۆژیکیانە) و دوورکەوتۆتەوە لە شێوازی ئەدەبی لە نووسیندا.

وتار لە پێناو لێکدانەوەی لایەنێکی دیاریکراوی ژیانی ڕامیاری و ئابووری و بازرگانی و زانستی و ئەدەبی و هونەری دەنووسرێت، تەنها پیشاندانێکی لایەنگیری نییە بەڵکو لێکدانەوەیی و ڕەخنەییە.

بۆیە وتاری ڕۆژنامەنووسی هەمیشە میوانی لاپەڕەکانی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانە بە هۆی پێداویستی بوونی ڕەخنە بۆ بابەتەکان و لێکدانەوەیان بۆ خوێنەر.

## پێناسەکانی وتاری ڕۆژنامەنووسی

**پێناسەی وتار بریتییە لە:**

(هونەرێکی ڕۆژنامەنووسییە باس لە بابەتێکی دیاریکراو دەکات بە توێژینەوەو وەسف و لێکدانەوە و بە خستنەڕووی ئاکامەکەی کۆتایی پێدێنێ).

**هەروەها پێناسە دەکرێ بەوەی کە:**

(بیرۆکەیەکە نووسەر لە ئەنجامی ژیانی لەگەڵ هەواڵ و بۆچوون و ئاقار و هەڵوێست و کێشە کاریگەرەکان لەسەر خوێنەر و جموجوڵی کۆمەڵ، وەردەگرێ و هەڵدەستێ بە شیکردنەوەی و لایەنگیری خۆی یان دژایەتیکردنی بە زمانێکی ڕوون وبە شێوازێك کە کەسێتی و بیرۆکەی دەخاتە ڕوو ئەمەش لە کاتێکی گونجاودا و بە قەبارەیەك کە بگونجێ لە گەڵ جۆرو بایەخ و ئامانجەکەیدا).

**پێناسەیەکی تر بۆ وتار:**

نووسراوێکە نووسەر بە شێوازێکی تەکنیکی دیاریکراو و قەبارەیەکی گونجاو و زمانێکی ڕوون، ئامادەی دەکات، بۆ بڵاوکردنەوەی لە ڕۆژنامە یان گۆڤارێکدا، لە



چوارچێوەی ڕاڤەکردن، یان ئاراستەکردن، یان ڕەخنەی یان بەشیکردنەوە لەگەڵ ڕووداو هەڵوێست و دۆخ و بیرۆکەکان یەکیدەخات لە پێناو هۆشیاکردنەوەی خوێنەر وە دووپاتکردنەوەی بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی و گرنگی ڕۆڵێ ڕۆژنامە یان گۆڤار وەك ئامرازێکی بڵاوکردنەوە.

**وتاری ڕۆژنامەنووسی بریتییە لە:**

(پارچەیەکی سنوورداری چاپکراو بە شێوەیەکی ڕێکوپێك لە ڕۆژنامەدا و لە شوێنی دیاریکراوی لاپەڕەی خۆی و دەربڕینی نووسەر خۆیەتی لە بارەی کێشەیەك یان ڕووداوێکی دیاریکراو).

**کۆڕی زانیاری بەریتانی پێناسەی وتار دەکات بە:**

(بابەتێکی قەبارە ناوەنجیە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاو دەکرێتەوە و بۆ چارەسەری کێشەیەکی دیاریکراو، بە ڕێگەیەکی سادەو کورت و پێویستە نووسەر بە سنووری بابەتەکە پابەند بێت).

**محەمەد یوسف پێناسەی وتار دەکات بە:**

(پارچە پەخشانێکی درێژی سنووردارە، بە ڕێگەیەکی هەڕەمەکی و خێرا و بە شێوەیەکی سادەو ڕەوان دەنووسرێ و مەرجی یەکەمی ئەوەیە گوزارشتێکی ڕاستگۆیانەیەی نووسەر بێت).

**ئەدیب خزور پێناسەی وتار دەکات بە:**

(جۆرێکی ڕۆژنامەنووسییە کە جیادەکرێتەوە بە گشتگیری و قوڵبوونەوە بۆ بابەتەکە و شیکردنەوەی ڕووداوەکانی ژیانی فیکری و ماددی کۆمەڵگا).

**هەروەها پێناسەیەکی تری وتار:**

(ئەو وتارەیە کە ڕۆژنامەکان بڵاوی دەکەنەوە بۆ باسکردنی ئەو پرسیارانەی خراونەتە ڕوو یان ئەو مەسەلانەی گرنگییەکی هەنووکەیی هەیە پەیوەستە لە ژیانی ڕۆژانەی خوێنەردا یان ئەوەی لەوانەیە ڕوویدات لە داهاتوویەکی نزیکدا ئەم جۆرە بە بە ڕەوانبێژی ڕۆژنامەیی دەژمێردرێ).

## دەرکەوتنی وتاری ڕۆژنامەنووسی

نووسەری فەڕەنسی میشیل ئیکێم مۆنتێن (۱۵۳۳-۱۵۹۲) بە دامەزرێنەری وتار دادەنرێت، یەکەم هەوڵی لە بواری وتارنووسیندا ئەو وتارانە بوو کە لە بارەی یادەوەرییەکانی خۆی لە قۆناغی منداڵیدا دەینووسیّ. کاتی کە وتارەکانی مۆنتێن وەرگێردرایە سەر زمانی ئینگلیزی ناویان نا (هەوڵەکان) ئەو وتارانە بە شێوازی مۆنتێن نووسرابوو ئەم وەرگێڕانە کاریکردە سەر ئەدیبانی ئینگلیز لە پێشەوەیان فەرەنسیس بیکۆن (۱٥٦۱ – ۱٦۲٦) و باراهام کولی (۱٦۱۸ -۱٦٦۷) و جۆن دریدن (۱٦۳۱ – ۱۷۰۰) و ولیەم تمبل (۱٦۲۸ – ۱٦۹۹)

وتارەکانی فڕەنسیس بیکۆن بە پەسەندترین وتاری ئینگلیزی سەردەمی خۆیان وەسف دەکرێن و بە وردبوونەوە و پاراوی بابەتی فیکری، دەناسرێنەوە.

بەڵام وتارەکانی باراهام گولی مۆرکی زاتی و هەڵقوڵاو لە دەروونی خۆیەوەیان پێوە دیارە، و ئاماژە بە ئاخاوتنی نێوان هاوڕیّ خۆشەویستەکانی خۆی دەکەن و ناونیشانی وتارەکانی ناودەبا بە "قسەی هەمەجۆر" و ناوی دەبەن بە باوکی وتاری ئینگلیزی ڕەخنەگران.

## جۆرە گشتییەکانی وتار

**۱. وتاری زانستی:**

ئەو وتارەیە کە پشت بە سەرچاوەی زانستی دەبەستیّ و لە بارەی بابەتێکی زانستی پوختەوە دەنووسرێت و تەنها لە پەڕاو و گۆڤارە تایبەتییەکاندا بڵاودەکریتەوە و سوودی بۆ هەمووان نییە. بەو شێوەیە بۆمان دەدەکەوێت کە بابەتە بڵاوکراوەکانی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بۆ گشتییە نەك تایبەتی لە بەر ئەوە نووسەری وتاری زانستی وتارەکانیان لە گۆڤارە تایبەتەکاندا بڵاودەکەنەوە بۆ ئاگادار بوونی پسپۆڕانی بواری زانستی.



**۲. وتاری ئەدەبی:**

ئەو وتارەیە نووسەر وشەی ئەدەبی تیادا بەکاردێنێت بۆ دەربڕینی هەستی خۆی و پێویست ناکات گوزارشتێك بێت کە ڕای گشتی سەرقاڵ بکات، بۆیە شوێنی ئەم وتارە لاپەڕە ئەدەبییەکانە و لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا وە زۆر جار نووسەر درێژەی باس و شێواز لە بەرچاو دەگرێت.

**۳. وتاری ڕۆژنامەنووسی:**

بایەخدارترین جۆری وتارە لە جیهانی ڕۆژنامەنووسیدا زۆر جار لاپەڕەی تایبەتی بۆ دابین دەکرێت و لە ڕووی بابەتەوە دابەشدەکرێت بۆ وتاری ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی و هونەری و وەرزشی.

ئەم بەشەش تەرخان دەکەین بۆ وتاری ڕۆژنامەنووسی:

## تایبەتمەندێتیی وتاری ڕۆژنامەنووسی

**أ- دەرنەچێت لەوەی کە هونەرێکی ڕۆژنامەنووسییە:**

جیاوازییەکی زۆر لە نێوان هونەری ڕۆژنامەنووسی و هونەرەکانی تری نووسین هەیە دیارترینیان ئەوەیە کە بە زمانێکی پاراو بنووسرێت بۆ خوێنەر و لە بارەی ئەو بیرۆکەیەوە و تەنیا هەواڵ و ڕاپۆرت نەبێت، هەروەها بە شێوازیکی ڕوون و سادە و ئاسان دوور لە ئاڵۆزی بنووسرێت. ڕۆژنامە و گۆڤارەکان ئامانجیان گەیاندنی زانیاری و بۆچوونە، بۆیە وتار نابێت لە هونەری ڕۆژنامەنووسی دەربچێت و ڕاپۆرتنووس دەبیّ جیاوازییەکانی هونەری ڕۆژنامەنووسی لەبەرچاوبگرێت بۆ ئەوەی وتارەکەی بۆ بڵاوکردنەوە بشیّ، بە پێچەوانەی توێژینەوەی زانستی و ڕۆشنبیری کە پێکدێت لە دەیان پەڕە و بە زمانێکی تایبەت نووسراوە و لە ڕۆژنامەو گۆڤارە گشتییەکاندا بڵاوناکرێتەوە تەنها لە گۆڤاری تایبەتی نەبێت.

**ب- فەرمانی دیاریکراوی خۆی ئەنجام بدات:**

هەر هونەرێك ئامانجی خۆی هەیە هەوڵ دەدات لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەیەوە پێیبگات. ئەگەر ئامانجی هەواڵ و ڕاپۆرت ناساندنی خوێنەران بێت بە ڕووداو و بۆچوونە کەڵەکەبووەکان و ئامانجی چاوپێکەوتن دەستکەوتنی زانیاری و بۆچوون بێت ئەوا ئامانجی وتار بریتییە لە شیکردنەوەی بابەت و مەسەلەکان و فرەکردنی زانیاری و لێکدانەوەو ڕەخنەگرتن لێی.

**ت- قەبارەی دیاریکراوی هەبێت:**

دەبێت وتار ژمارەی وشەکانی دیاریکراو بێت لە ڕادەی خۆی دەرنەچێت بۆ ئەوەی لە پەڕەی وتاردا جێیی بێتەوە و وتارنووس وردبێتەوە لە بابەتەکە و کەمترین وشە و ڕستە بەکاربهێنێت واتە بە کورتی ئەو بیرۆکەیەی کە پێشنیازی کردووە دووبارەی نەکاتەوە یان زۆر نەچێتە قوڵایی شیکارییەوە و بوار بدا بە خوێنەر بچێتە قوڵایی بابەتەکە و بیرۆکەکە ئاشکرا بکات.

**پ- بە زمانێکی ئاسان (زانراو) ڕۆژنامەنووسی بنووسرێت:**

مەبەست لە زمانی ئاسان واتە وتارنووس وشەی پاراو و شێوازی ڕوون بەکاربهێنێت و دوور لە ئاڵۆزی، چونکە وتار بواری پیشاندانی توانای فیکری و زمانەوانی تێدا نییە بەڵکو ئاشکراکردنی بیرۆکەیەکە لە ڕێگەی لێکدانەوەی بابەت و مەسەلەکان.

## دابەشکردنی وتاری ڕۆژنامەنووسی

**١. دابەشکردن لە ڕووی بابەتەوە:**

أ- وتاری ڕامیاری:

ئەو وتارەیە کە مەسەلە ڕامیارییەکان لەخۆدەگرێ بە لێکدانەوەو خستنەڕووی لەپێناو ئاشکراکردنی ئایدیاو ئاراستەی ڕامیاری و زۆرجار ڕۆژنامەکان پەڕەی تایبەت بۆ



وتاری ڕامیاری تەرخان دەکەن و زۆر جار لەگەڵ ڕاپۆرتدا بڵاودەبێتەوە، و ئەو لاپەڕە ناو دەبرێت بە (ڕاپۆرت و ڕاوبۆچوون).

ب- وتاری ئابووری:

ئامانجی ئەم جۆرە وتارە باسکردنی مەسەلە ئابوورییەکانە لەپێناو لێکدانەوە و ئەژمارکردن و ئاشکراکردنی ئایدیای تایبەت و زۆرجاریش بەستنەوەی بە بارودۆخی ڕامیاری ناو وڵاتەوە.

ت- وتاری کۆمەڵایەتی:

باس لە بابەتێك یان کێشەیەکی کۆمەڵایەتی دەکات بە خستنەڕوو و لێکدانەوە تادەگاتە پێشکەشکردنی ڕاسپاردەی پێویست یان تەنها خستنەڕوو و شیکردنەوە.

پ- وتاری ڕۆشنبیری:

ئەم جۆرە وتارانە ئامانجیان باسکردنی بابەت و مەسەلە ڕۆشنبیرییە نوێیەکانە کە زۆر جار شایانی گفتوگۆی بنەڕەتی دەبێت لە نێوان توێژەکانی کۆمەڵگادا.

ج- وتاری زانستی:

ئەم جۆرە وتارە وەك چەشنەکانی تری وتار نییە، بەڵکو وەك وتارە ڕۆژنامەنووسییەکانە و بە شێوازی ڕۆژنامەنووسی دەنووسرێت بەڵام بابەتەکەی زانستییە وەك نووسینی وتارێك لە بارەی نیشاندانی یەکێ لە داهێنانە نوێیەکان.

ح- وتاری هونەری

ئەم جۆرە وتارە نیشاندان و شیکردنەوەی یەکێ لە بابەتە هونەرییەکان لەخۆدەگرێ. ڕۆژنامەنووس ناچار دەبێت گەواهی بدات بە ڕووداوی مێژووی لەکاتی باسکردنی هونەریدا.

خ- وتاری وەرزشی

یەکێ لە بابەتە وەرزشییەکان لەخۆدەگرێ کە زۆر جار ڕۆژنامەنووس هەوڵ دەدات شیکردنەوەی بۆ بکات بۆ ئەو هەلومەرجەی کە پەیوەستە پێوەی.

د- وتاری کیشە و ململانێ:

لەم جۆرە وتارەدا ئەو کێشەو ململانێیانەی کە کاریگەری هەیە لەسەر مرۆڤ باس دەکرێت وەکو جەنگەکان و ناکۆکییە نێودەوڵەتییەکان و جەنگی ئەهلی.

**٢. دابەشکردن لە ڕووی ئامانجەوە:**

أ- وتاری داخوازی (دعائی)

خوێنەر لێرەدا ئامانجی بەکارهێنانی هێمای زمانەوانی و بیانوو بەڵگەی نزیك لە لۆژیکە یان لۆژیکییە لە پێناو:.

١) دلّدانەوە (نەوازشی)

لە میانەی دواندنی سۆز و هەستی خوێنەر وەك نووسینی ئەو وتارەی کە لەلایەن یەکێ لە ڕۆژنامەنووسانەوە دەنووسرێت بە شێوەیەکی دلّدانەوە بۆ ئەو وێرانکاریانەی تووشی عێراق بوون لە دوای گۆڕانکارییەکانی ساڵی ٢٠٠٣ و بە شێوازێکی نەوازشی سۆزی خوێنەر دەدوێنێ بە وردبوونەوە لە ژمارەی کوژراو بریندارو تێکدانی شارەکان و ژمارەی ئەو عێراقیانەی کە وڵاتیان جێهێشتووە.

٢) نەوازشی ژیری

ئەمە لە ڕێگەی ژیری(عەقل)یەوە خوێنەر دەدوینێ زۆر جار بە خستنەڕووی بەڵگەو بیانوی لۆژیکی یان نزیك لە لۆژیکەوە ئەنجام دەدرێ بۆ نموونە یەکێ لە ڕۆژنامەنووسان لە وتارێکدا ئاماژە بۆ ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە ساڵی ٢٠٠٣ لە عێراقدا ڕوویداوە زۆر پێویست لە قەڵەمی دەدا لەپێناو دانانی دادپەروەرییەکی ڕاست و ئازاد وە باشکردنی باری ئابووری.

٣) نەوازشی ترس:

ئەمەش لە میانەی بەکارهێنانی ئەو وشانەوە دێت کە هێماکانی بە ئاشکرا هەڕەشەی پێوە دیارە. زۆر جار وتارنووس ئەم شێوازە بەکاردێنێت لە کاتی جەنگ و قەیران و بارودۆخی نائاسایی لە پێناو تۆقاندنی خوێنەر لەوەی کە بەشدار بن لە دژواربوونی بارودۆخی ئاسایشی.



ب- وتاری ڕاستکردنەوە:

ئەم جۆرە وتارانە ڕۆڵی چاککردنەوە دەبینێ لە ڕێگای پێشنیازکردنی چارەسەر بۆ کێشە بڵاوبووەکانی ناو کۆمەڵگا.

وتارنووس وێنەو بەڵگەنامە و دەرخستە دەستکەوتووەکان لە بارەی کێشەیەك یان خەوشێك کە ڕوویداوە لە یەکێ لە بوارەکانی ژیاندا دەخاتەڕوو پاشانیش پێشنیازی چارەسەری بابەتیانەی ئەو کێشەیە دەکات.

ت- وتاری ئاراستەکردن:

ڕێنوینیکردنی کۆمەڵ زۆر جار پێویستی بە ئامۆژگارییە بە هۆی گوێپێنەدانیان بۆ هەندێ لە لایەنەکانی ژیان کە نادیارە لایان. بۆیە ڕۆژنامەنووسان لە وتارەکەیاندا هەڵدەستێ بە ئاراستەکردنی کۆمەڵ و ئاگادارکردنەوەیان، بەڵام بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بۆ ئەوەی خوێنەر هەست بکات کە ڕۆژنامەنووس دەیەوێ لە شارەزایی خۆیی بداتێ و بە ڕێگایەکی بابەتی کە ڕەخنەو لێکدانەوەی بە دوادابێ.

## چەشنەکانی وتاری ڕۆژنامەنووسی

**١. وتاری شیکاری:**

ئەم جۆرە وتارە ڕووداوە ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی و زانستی و هونەرییەکانی باسدەکات بە لێکدانەوەو شیکردنەوەو ڕاڤەکردنەوەی بە پلەی یەکەم لەپێناو ناساندنی بەخوێنەر بە ئامانجی ناساندنی بابەتی وتارەکە بە خوێنەر. زۆرجاریش باسی بابەتی هەنووکەیی دەکرێت لە پێناو ڕاکێشانی سەرنجی خوێنەر یان باسی مەسەلە و بابەت دەکرێ کە ڕای گشتی بە لێکدانەوەی سەرقاڵ دەکات. ئەم جۆرە بە دیارترین جۆری وتاری ڕۆژنامەنووسی دادەنرێت و زۆرترین کاریگەری هەیە. وتاری شیکاری زۆرینە باسی بابەتی هەنووکەییی دەکات، ڕامیاری بێت یان ئابووری یان کۆمەڵایەتی و

هونەری لە پێناو شیکردنەوەی بواری دیاریکراو و پێناسەیکردنی بابەخەکەی بۆ خوێنەر.

زۆربەی زۆری لایەنەکانی ژیان پێویستی بە شیکردنەوە هەیە بۆ ئەوەی تاکەکان لێیان بەئاگابن، بابەتە ڕامیاری و ئابووری و هونەری و زانستییەکان پێویستیان بە شیکردنەوەیە لە لایەن ئەو ڕۆژ نامەنووسەی شارەزایی بۆ لایەنەکانی و پێشینەیەکی هەیە. ئەم جۆرە وتارانە ئامانجی شیکردنەوەی بابەتەکانە بە ڕێگایەکی بابەتیانە.

بوارەکانی وتاری شیکاری:

أ- مەسەلەو ڕووداوی ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی و زانستی و هونەری.

ب- بابەتە نوێیەکانی ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی و زانستی و هونەری.

ت- ڕووداوە گرنگەکان لە گشت بوارەکاندا.

پ- ئەو بۆچوونانەی کە پێشنیاز دەکرێ لە لایەن سیاسەتمەداران و لە گشت بوارەکاندا.

ئەرکەکانی وتاری شیکاری:

أ- لێکدانەوەی مەسەلە و بابەت و ڕووداو.

ب- ڕاڤەکردنی مەسەلە و بابەت و ڕووداو.

ت- شیکاری مەسەلە و بابەت و ڕووداو.

پ- ناساندنی باری سەرنجە جیاوازەکان لە مەرکێشەیەك بە خوێنەر.

### ٢. وتاری دیالۆگخواز:

ئەم جۆرە وتارانە ناودەبرێت بە (وەڵام) یان (بەرپەچدانەوە) کە ئەو وتارەیە وەڵامی وتارێکی تر دەداتەوە کە ڕۆژنامەنووسێکی تر نووسیوێتی، لەم وتارانەدا جیاوازی بۆچوونەکان لە نێوان ڕۆژنامەنووسەکاندا ئاشکرادەکات و هەندێ جاریش بۆچوونی هەڵە ئاشکرا دەکات کە ڕۆژنامەنووسێك هەوڵ دەدات خوێنەری پێ ڕازی بکات و ڕەواج بە زانیاری هەڵە بدات.



### ٣. وتاری مێژوویی:

ڕۆژنامەنووس لەو جۆرە وتارەدا مەسەلەیەك یان دەزگایەك یان کەسایەتییەك لە ڕووی مێژووییەوە دەخاتەڕوو وە هەڵدەستێ بە خستنەڕووی لایەنە جیاوازەکانی بە زمانێکی ڕۆژنامەنووسی نەك بە زمانی دانانی کتێبی مێژوویی.

### ٤. وتاری ڕەخنەگرانە:

ئەو وتارەیە کە هەڵدەستی بە خستنەڕوو و ڕاڤەکردن و شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی مەسەلەکان و بابەتە ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و هونەری و زانستی و دەرخستنی لایەنی باش و خراپی ئەویش لەپێناو هۆشیارکردنەوەی خوێنەر بۆی و هاوکاری دروستکردنی بۆچوونی ڕوون و ڕەخنەگرانە بە باش و بەخراپ.

بوارەکانی وتاری ڕەخنەگرانە:

أ- مەسەلە ڕامیارییەکان و هەڵوێست و بابەتی ڕامیاری.

ب- مەسەلە ئابوورییەکان و هەڵوێست و بابەتی ئابووری.

ت- مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان لەوانە کێشەو مەسەلە و بابەتی کۆمەڵایەتی.

پ- بوارە ئەدەبییەکان وەك لە چیرۆك و ڕۆمان و هەڵبەست.

ج- بوارەکانی ڕاگەیاندن وەك ئێزگە و تەلەفزیۆن بە هەموو جۆرەکانییەوە.

ح- بوارە زانستییەکان لە نووسراوەکان و پەڕاو توێژینەوەکان و.....هتد.

### ٥. وتاری ڕۆژانە (ڕۆژانەی ڕۆژنامەیی):

بریتییە لە شێوە باوەکانی ڕۆژنامەنووسی ئێستا و لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا و توخمێکی بنەڕەتییە تیایدا و پشت بە بوونی نووسەری ڕۆژنامەنووس و ئەدیبانی هەڵکەوتوو دەبەستێ کە جیادەکرێنەوە بە نایابی شێوازیان وە دەوڵەمەندی ئەزموونیان وە شارەزایی مرۆڤایەتیان و ئەم جۆرە وتارانە پێیان دەوترێت وتاری ڕۆژانە یان ڕۆژانەی ڕۆژنامەنووسی.

**ئەرکەکانی وتاری ڕۆژانە**

**وتاری ڕۆژانەیی کۆمەڵێك ئەرك بەجێ دەگەیەنێ و گرنگترینیان:**

١. ڕاڤەکردنی ڕووداوە هەنووکەییەکان و خستنەڕووی بۆچوون لەسەر مەسەلە گرنگەکان.

٢. ئاگادارکردنی خوێنەر لە ڕووداوەکانی دەوروبەری لەوانە: ڕووداوی ناوخۆیی و جیهانیە بە شێوەیەك زانیاری و ڕاستی پێشکەش بە خوێنەر دەکرێت کە یارمەتی بدات بۆ وەرگرتنی هەڵوێست و پێکهێنانی بۆچوون و ئاراستەی ئەم ڕووداوە.

٣. پێشکەشکردنی ئەزموونی سەرکەوتوو بۆ خوێنەر لە ڕێگەی گفتوگۆ و ئاخافتنی کەسی. وتارنووس کە ڕۆژانە پێشکەشی دەکات و تیایدا ئەزموونی ژیانی خۆی دەردەخات.

٤. ئاراستەکردنی خوێنەر بۆ هاوبەشیکردنی ئەو چالاکیانەی کە پەیوەستە بە گەشەپێدانی کۆمەڵایەتییەوە یان بەشداریکردنی سیستەمی ڕامیاری یان کۆمەڵایەتی دیاریکراو.

٥. پێکهێنانی ڕای گشتی لە کۆمەڵدا و کاریگەری لەسەر ئاراستەی چ بە باش یان بەخراپ.

٦. لێکدانەوەی کارە هونەری و فیکری و ڕۆشنبیرییەکان و هەڵسەنگاندنیان.

٧. ڕۆشنبیرکردن لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی زانستی مرۆڤایەتی.

٨. ڕابواردن و کات بردنەسەر لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی بۆچوونی سەرگەرمی و گاڵتەجاڕی و دانسق.

وتاری ڕۆژانەیی جیادەکرێتەوە لە چەشنەکانی تری نووسینی ڕۆژنامەنووسی بەم تایبەتمەندییانە:

أ- فرەبوون و هەمەجۆری ئەو بابەتانەی ڕۆژنامەنووس مامەڵەی لەگەڵدا دەکات و لە سەری دەنووسێ. نووسەر ئاماژە بەو بابەتانە دەکات وەك بابەتی ڕامیاری و



کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری، کە پەیوەندییان بە ژیانی خەڵکەوە هەیە، و تێبینی و بۆچوون و ئەو شارەزاییەی لە ئاکامی هاتووچۆکردنییەوە دەستیکەوتووە لە ڕووداوە ڕۆژانەییەکاندا بەرجەستە دەبێ. وتاری ڕۆژانە خۆی بەپسپۆڕانی بوارێك نابەستێتەوە، بەڵکو نووسەر بە نەرمی و هەمەجۆری بابەتەکان هەڵدەبژێرێ.

ب- ڕۆژانەی ڕۆژنامەنووسی شارەزایی و بایەخپێدانی تایبەتی و کەسێتی نووسەر سەبارەت بە مەسەلەکانی ژیان لە دیدی خودی نووسەرەوە دەخاتە ڕوو هەندێ جار خۆمان لەگەڵ نووسەردا دەبینینەوە و بە زاتیەتی نووسەر قایل دەبین. چونکە سرووشتی ئەم جۆرە نزیکە لە دانپێدانان و خواستی ڕۆژانە و زۆر لە بنەماکانی ئەدەب وەردەگرێ.

أ- ڕۆژانە یادەوەری و ئەندێشە و ئەزموون و سروشتی نووسەر پێشکەشدەکات لە باسکردنی کاروبارەکانی ژیاندا لە گۆشەیەکی کەسییەوە ئەو ئەندێشە و بۆچوونەکانی خۆی دەنووسێ لەسەر ڕووداوە ڕۆژانەییەکان. باترسۆن لە پێشەکی کتێبەکەیدا لە بارەی هونەری وتاری ڕۆژنامەنووسییەوە دەڵێ: (خوێندنەوەی یاداشت و یادەوەرییەکان لە لایەن خەڵکەوە مەسەلەیەکی دڵخۆشکەرە، هەندێ جار نووسەر دان بە هەڵەکانیدا دەنێ و جاروبار بیانووی بۆ دەدۆزێتەوە، بە جۆرێك کە لاوازی و شکستی تاکەکەسی دەبێتە بابەتێك و بە شێوەیەکی تەکنیکی چارەسەری دەکات. ئەم وتاری ڕۆژانەیە ئاماژە بۆ بارودۆخی هەندێ لە توێژەکانی کۆمەڵگا دەکا و حاڵەتە نائاساییەکان دەخاتەڕوو ئەمەش یارمەتی خوێنەر دەدا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بارودۆخی دژوار لە ژیانیدا.

## شێوازە تەکنیکییەکانی نووسینی وتار

## شێوازی چوارچێوەی هەرەمی ڕێك (چیرۆك –Story)

ئەم شێوازە لە سێ بەش پێکدێت:

**أ- پێشەکی:**

پێشەکی وتار ئەمانە لەخۆدەگرێ:

١) وتارنووس هەڵدەستی بە وروژاندنی بیرۆکەیەك.

٢) کێشەیەك کە وتارنووس پیشانی دەدات.

٣) ڕووداوێك کە وتارنووس وەکو دەروازەیەك بەکاری دێنی بۆ وتارەکەی.

**ب- کرۆك:**

کرۆکی وتار ئەمانە لەخۆدەگرێ:

١) خستنەڕووی بیرۆکەیەك بە شێوەیەکی درێژەپێدراو.

٢) شیکاری و ڕاڤە و لێکدانەوەی کێشەیەك کە وتارنووس دەیخاتەڕوو.

٣) بەستنەوەی ئەو ڕووداوەی کە وتارنووس پێشنیازی کردووە بە ڕووی وروژێنەری دیکەوە وخستنەڕووی رووی بەراوردکردن لە نێوانیاندا.

٤) پێشنیازکردنی گۆشەنیگای جیاواز لە بابەتە پێشنیازکراوەکە.

**ت- کۆتایی:**

کۆتایی وتاری ڕۆژنامەنووسی پێکدێت لە:

أ- دواین هەڵسەنگاندن بۆ کێشەکە.

ب- داخوازی بۆ خوێنەر بۆ بیرکردنەوە بە ڕاستی (جددی) لە مەسەلەیەکی پێشنیازکراو پاش پێشکەشکردنی بەڵگەو بیانوو بۆ بایەخەکەی.



## ئەرکەکانی وتاری ڕۆژنامەنووسی

وتاری ڕۆژنامەنووسی کۆمەڵێك ئەرکی هەیە گرنگترینیان ئەمانەن:

١. **ڕاگەیاندن:**

ئەویش بە پێشکەشکردنی زانیاری و بیرۆکەی نوێ لەسەر ئەو رووداو و مەسەلانەی کە ڕای گشتی سەرقاڵ دەکەن.

٢. **لێکدانەوەو ڕاڤەکردن:**

واتە باسکردنی رووداوە هەنووکەییەکان و لێدوان لە سەریان بەو شێوەیەی کە تەوەر و ڕەهەند و لایەنە جیاوازەکانی ڕووندەکاتەوە.

٣. **ڕۆشنبیرکردن:**

ئەویش لە ڕێگەی باسکردنی نووسەر بۆ ئەو مەسەلانەی کە دەبێتە هۆی بڵاوکردنەوەی زانیاری مرۆڤایەتی جیاواز بۆ خوێنەر.

٤. **پڕۆپاگەندەکردن:**

پڕوپاگەندە بە یەکێ لەو ئەرکانە دادەنرێت کە وتاری ڕۆژنامەنووسی بە ئەنجامی دەگەیەنێ لە ڕێگەی گەورەکردنی ڕووداوێکی سیاسی یان ئابووری و داکۆکیکردن لەسەر هەڵوێستی هەندێ لایەن دوور لەوانەی دیکە، وە هەوڵی ڕاکێشانی سۆزی خوێنەر و هۆش بۆیان.

٥. **هاندانی جەماوەر:**

ئەویش لە ڕێگەی هاندانی جەماوەر بۆ پشتگیریکردن لە مەسەلەی دیاریکراو وەستان دژی مەسەلەیەکی تر.

٦. **ڕەخنەگرتن:**

واتە دۆزینەوەی کەموکورییەکان لە گشت دەزگاکاندا لەوانە: ڕامیاری و ئابووری و زانستی و کۆمەڵایەتی، و ئاراستەکردنی ڕەخنە بۆ چارەسەرکردنی.

**٧. کات بەسەربردن:**
واتە خۆش ڕابواردنی خوێنەر ئەمە ئەو ئەرکەیە کە وتاری سەرگەرمی و پێکەنیناوییەکان بە ئەنجامی دەگەیەنن.

## هەنگاوەکانی نووسینی وتاری ڕۆژنامەنووسی

**١- هەڵبژاردنی بابەت:**
وتارنووس دەبێ بابەتێك هەڵبژێرێت کە زانیاری تەواوی لەسەر هەبێت و بابەتەکەی گونجاو بێت لە لای خوێنەر، و لە ژیانی ڕۆژانەوە وەرگیرابێت، وەك ئەزموونی فێربوونی زمانی ئینگلیزی یان بینینی ڕووداوێك یان خوێندنەوەی ڕۆژنامە یان ئەزموونێکی تاڵ.

**٢- دیاریکردنی ئامانجی وتار:**
یەکێ لە هۆیەکانی سەرکەوتنی وتار دیاریکردنی ئامانجەکەیەتی کە ئەویش یارمەتیمان دەدات بۆ دوو کار:
بزانێت چی دەنووسێت و چۆن دەنووسێت؟

**٣- هەڵبژاردنی ناونیشانی وتار:**
هەڵبژاردنی ناونیشانی وتار زۆر پێویستە چونکە یارمەتی دیاریکردنی بابەتی وتارەکە دەدات، لەبەر ئەوە پێویستە ناونیشان دیاریکراوو ڕوون بێت و دوور بێت لە ئاڵۆزی و نیشانەی چارەسەرکردنی یەك مەسەلە زیاتر نەبێ. بۆ نموونە تێبینی ئەم ناونیشانە بکە (گەشەپێدان و هۆشیارکردنەوەی هاووڵاتیان لێپرسراوێتی کێیە؟)

**٤- نەخشەی وتار:**
نەخشەی وتار پێکدێت لە پێشەکی، کرۆك، کۆتایی.

أ- پێشەکی:

١) بە ڕستەیەك دەستپێدەکات کە هۆشی خوێنەر بۆ بابەتەکە ڕابکێشێت.
٢) دواتر ڕستەیەك بۆ دیاریکردنی ئامانجی وتارەکە.



٣) کۆتایی دێت بە دیاریکردنی بواری وتارەکە و ئامادەکردنی بۆ خستنەڕوو.
٤) پێویستە پێشەکی کورت بێت و گونجاو بێت لەگەڵ بابەتەکەیدا.

ب- کرۆك:

١) کرۆك بەشی گەورەی وتارەکەیە کە نووسەری بابەتەکە یان مەسەلەکە یان کێشەکە بە لێکدانەوە و شیکارییەوە باسی دەکات تا دەگاتە ئامانجی وتارە ڕۆژنامەنووسییەکە.
٢) ئەم بەشە سێ بەشی قەبارەی وتارەکەی لێپێکدێت.

تایبەتمەندێتی کرۆك:

أ- ڕیزبەندی لۆژیکیانەی بیرۆکەکە.
ب- وردی لە دەربڕیندا.
ت- ڕوونی شێوازەکەی.
پ- پیشاندانی بیرۆکەکە.
ج- پێشکەشکردنی بەڵگەی لۆژیکی.
ح- کۆتایی:
خ- کۆتایی وتار لە ٥ تا دە دێڕی کۆتایی و لە بڕگەیەك یان دوو بڕگە پێکدێت و تیایدا نووسەر بە کورتی ئاماژە بۆ بۆچوونی خۆی سەبارەت بە باسەکە دەکات.

## جۆرەکانی ناونیشانی وتار

١- ناونیشانی پرسیار:
ئەم جۆرە ناونیشانە بۆ ڕاکێشانی خوێنەرە بۆ بەردەوام بوون لە خوێندنەوەی وتارەکە و بەجۆرێ هەست بکات کە وەڵامی پرسیارەکە لە کرۆکی وتارەکەدا دەستیدەکەوێت. بۆ نموونە، کوا ڕۆڵی ڕێکخستنی گەل دژ بە تیرۆر؟

٢- ناونیشانی وەسفکار:
نووسەر لەم جۆرە ناونیشانەدا هەڵدەستێت بە وەسفکردنی بابەتی وتارەکە بۆ نموونە:

عێراق چەند ساڵی پێویستە تا بونیاد بنرێتەوە.
٣- ناونیشانی سەرسوڕمان نووسەر ئەم ناونیشانە بەکاردێنێت لە پێناو ئاماژەکردن بە بابەتەکە یان ئامانجەکەی وتەی دژ بەکاردێنی کە جێگای سەرسوڕمان بێت بۆ نموونە: سیاسەتی بێلایەنی لە بەرژەوەندی دەوڵەتە بێلایەنەکاندا نییە!
٤- ناونیشانی بەراوردکارانە: ئەو ناونیشانەیە کە بەراووردی نێوان دوو حاڵەتی جیاواز و دژ بە یەکتر دەخاتە ڕوو لەپێناوی هاندانی خوێنەر بۆ بەراودکردنیان بۆ نموونە: لە عێراقدا پارە زۆرە و ئاسایش نییە.
٥ — ناونیشانی پەند و وتە:
ئەو ناونیشانە کە نووسەر بەکاردێنی وەك وتەی ناودارەکان یان پەندێکی پێشینان کە گەواهی بابەتەکە دەخاتە ڕوودەدات بۆ نموونە: (سیاسەتی ئەمریکا سەبارەت بە کورد بانێکە و دووهەوا).

## زمانی وتاری ڕۆژنامەنووسی

زمانی وتاری ڕۆژنامەنووسی دەکەوێتە نێوان زمانی وتاری ئەدەبی و زمانی وتاری زانستی و لە وتاری ئەدەبی وتارنووس سۆز و ئەزموون و هەستی ویژدانی خۆی دەردەبڕێت بەرامبەر هەڵوێستێکی تایبەت یا گشتی، بەڵام وتاری زانستی ئامرازێکی جیهانییە بۆ وەسفکردنی ڕاستی زانستی لە میانەی ڕێبازێکی زانستی کە پشت بە ڕەهابوونێکی بابەتی دەبەستێ، بەڵام وتاری ڕۆژنامەنووسی شتێکی خۆیەتی و نووسینی ئەدەبی تێدایە، زمانی ژیانی ڕۆژانەیە واتە زمانی هاووڵاتیانی ئاساییە، زمانێکە هەموو خوێنەران تێیدەگەن هەرچەندە ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیان جیاواز بێت، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە زمانی وتاری ڕۆژنامەنووسی گشتی (عامیە) بێت و دوور بێت لە ڕێسای زمانەوانی، بەڵام پێویستە زمانی وتاری ڕۆژنامەنووسی زمانێکی پاراو بێت، بەڵام نەك پاراوی سەردەمی نەزانی یان چەرخی ناوەڕاست بەڵکو سەردەمی ڕۆژنامەنووسی واتە سەردەمی نوێ.



**سیاسەتی نزم و باڵەخانەی بەرز**

زیرەك کەمال / ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان

کەم کەس هەیە لەم وڵاتەی ئێمەدا گلەیی لەو میکانیزم و شێوازە کارکردنە نەبێت کە کایە ئیداری و حکومی و سیاسی و حزبییەکان لەسەر زەمینی واقیعی ژیاندا پیادەی دەکەن. میکانیزم و شێوازێك کە نەك خەڵکانی پسپۆڕ و ڕۆشنبیر، بەڵکو خەڵکی ئاسایی و سادەش دەزانێ کەوا بۆتە ژێرخان و سەرچاوەی بەرهەمهێنانی سەرجەم ئافات و قەیرانە کوشندە و پەتا سیاسییە کۆمەڵایەتییەکان، دیارە گەورەترین بەربەست و کۆسپ و ئاستەنگ لە بەردەم ڕەوتی کارکردن و گەشەنەکردن و دواخستنی ڕەوڕەوەی کایە ئیداری و حکومی و کۆمەڵایەتییەکان بەر لە هەموو شتێك لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و ئەو ئاڵۆزی و بە یەکدا چوونەیە کە لە نێوان حزب و حکوومەت و حزب و پەرلەمان و حزب و سەرجەم کایەکانی تردا هەیە حزب بەشێکە لە کۆمەڵگای مەدەنی و لە لایەکی تریش سەر بە فەلسەفەی سیاسییە، بەڵام کاری سیاسی و شێوازی خۆدەرخستن و نمایشکردن و کارکردنی حزب لە چوارچێوەی کۆمەڵگای مەدەنی نابێت زیاتر بێت، چونکە کاتێك حزب ئەوەی لە بیر دەچێت و خۆی دەکاتە چەقی بڕیاردان و داینەمۆ و سەرچاوەی شەرعییەت و یاسا و دەست دەخاتە نێو کاروباری پەرلەمان و حکوومەت، ئەو کاتە نەك هەر کۆمەڵگا و کایەکانی ژیان نوقمی گەندەڵی و ئیفلیجی دەبن، هەر خودی ژیان خۆی لە هەموو نرخ و مانا و لەزەتێك بەتاڵ دەبیتەوە بگرە پایە و شوێنگەی مەعنەوی و بوونی دەسەڵاتی یاسایی و جێبەجێکردنیش دەکەونە بەردەم گومانێکی قووڵ و لێپرسینەوەیەکی ویژدانی.
لەم ڕۆژانەدا و لە دوو ڕۆژنامەی حزبی ئەم دوو هەواڵەم بینی یەکەمیان دەڵێت: مەکتەبی سیاسی.........بە مەبەستی چارەسەرکردنی سوتەمەنی چەند لیژنەیەکی پێکهێنا. دووەمیان دەڵێت: مەکتەبی سیاسی لەگەڵ بەڕێوەبەرو ڕاوێژکارە گشتییەکانی وەزارەتی........کۆبووەوە. هەڵبەت هەواڵەکە ڕاستە و جۆرێك لە ڕاستگۆیی تێدایە، چونکە حزب خۆی ئەوە دەسەڵمێنێت کە نێوەندە ئیداری و حکومییەکان وەکو

بارەگایەکی حزبی خۆی سەیردەکات. گەڕامەوە ماڵەوەش شەو کەناڵی ئاسمانی تەلەفزیۆنێك لە یەکێك لە هەواڵەکانیدا گووتی: ئەمڕۆ کاك.......(کە پۆستێکی حزبی هەیە) کۆبوونەوەیەکی بە کرێکاران و بەڕێوەبەری (دەواجن) ەکان کرد ! ! و ڕێنویی و ئامۆژگاری کردن کە وریای نەخۆشی ئەنفلۆنزای باڵندە بن، لێرەدا من وایدەبینم کەوا بەبێ لە یەکتری جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و بەبێ دوورخستنەوەی دەستی حزب لە هەناوی کایە یاسایی و حکومییەکان ناتوانرێت هیچ جۆرە هیواو ئومێدێکمان هەبێت بۆ چارەسەرکردنی پەتاو قەیرانە قولەکان و، بگرە لە سێبەری بە ناو بە یەکداچوونی حزب و حکوومەت و حزب و پەرلەمان باسکردن لە هەموو جۆرە چارەسەرێك بۆ کێشە و قەیرانە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان هەولێکی بێ هودە و کارێکی بێ ئەنجام و ئاکامە، چونکە یەکێك لە ئیشکالییەت و کێشە و قەیرانە هەرە گەورەکان ئەوەیە کە حزب هەیە لە بیری چووە کە بەشێکە لە کۆمەڵگای مەدەنی، خەریك بوو نووسینەکەم تەواو بکەم گلێنەی کچم کە پۆلی دووەمی ناوەندییە گووتی بابە ئەمڕۆ کابرایەك یەك دنیا چەکداری لەگەڵ بوو هات کۆبوونەوەی بە ئێمە کرد و پێی گووتین نابێت لە قسەی دایك و باوکتان دەربچن، هەڵبەت ئەو کابرایەش کادێرێکی دیاری حزبێکە و دەبێت ئەوەش بگووترێت کە قەیران و کێشە و ئافاتەکان چین و توێژە ڕەنجدەر و هەژارەکانی کۆمەڵگا دەهاڕێت، بەڵام بەرپرسە گەورەکانی نێوەندە ئیدارییەکانیش وەکو ئەوان گلەیی دەکەن، هەڵبەت گلەیی ئەوانیش بۆ داگیرکردنی شوێنگەی ئۆپزسیۆن و ˇ!! هەم بۆ خۆ دەربازکردنیشە لە هەر بەرپرسیارێتییەکی مێژوویی، ئەم دیاردانە تا کەی؟ بە ڕاستی ئەم دۆخە ئاخۆ بەرەو کوێ مل دەنێت، دۆخێك باڵەخانەکان بەرەو بەرزی و سیاسەتیش تا دێت لە نزمترین و ناشیرینترین فۆرمدا خۆی نمایش دەکات.

## سەرەتا

سەروتار بریتییە لە دەربڕینی بۆچوونی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامە یان گۆڤار، ئەم هونەرە جیاوازە لە هونەرەکانی تری ڕۆژنامەنووسی بەوەی کە دەربڕی سیاسەتی ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارەیە کە تیایدا بڵاودەکرێتەوە بە شێوازێکی جیاواز دەنووسرێت لە شێوازەکانی تەکنیکی ڕۆژنامەنووسی و زۆرجار واژۆی نووسەرەکەی لەسەر نییە بەڵکو واژۆی دەستەی نووسەرانی لەسەرە.

سەروتار هونەرێکە لە هونەری ڕۆژنامەنووسی و هەموو مافەکانی هونەرەکانی تری هەیە، لەگەڵ بوونی جیاوازی لە نێوانیاندا، بەڵام ئەم هونەرە گرنگییەکی گەورەی هەیە لە ناساندنی سیاسەتی ڕۆژنامە یان گۆڤارەکە بە خوێنەر. زۆر لە خوێنەران زانینی سیاسەتی ڕۆژنامە یان گۆڤار گرنگە بە لایانەوە.

لە زۆرینەی ڕۆژنامەکاندا سەرنووسەر نووسەری سەروتارە و زۆرجاریش ئەم کارە دەسپێرێت بە بە بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان یەکێ لە ڕۆژنامەنووسەکان لە وانەی کە شارەزاییان هەیە لە نووسینی ڕۆژنامە و شارەزان لە سیاسەتی ڕۆژنامەکە و زۆر لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان تەنیا لە کاتی ڕووداو مەسەلە و بابەتی نوێدا سەروتار دەنووسن چونکە بڕوایان بە بایەخ و ڕۆڵی سەروتار هەیە لە ڕۆشنبیرکردنی خوێنەر بە سیاسەتی ڕۆژنامەکە.



## پێناسەکانی سەروتار
## Definitions of Editorial

دەتوانرێت سەروتار پێناسە بکرێت بە:

(هونەرێکی ڕۆژنامەنووسییە هەڵدەستی بە شیکردنەوە و لێکدانەوە و ڕاڤەکردن و هەڵوێست پیشاندان سەبارەت بە بابەتە جۆراوجۆرەکان بە پێی سیاسەتی ڕۆژنامەکە).

هەروەها سەروتار پێناسە دەکرێ بە:

بۆچوونی ڕۆژانەی ڕۆژنامەیەکە لەسەر مەسەلەیەکی گرنگ سەرنووسەر یان نووسەرێکی بەناوبانگی (ناسراو) کە نزیك بێت لە بوارەکەیەوە هەڵدەستێ بە نووسینی و لە شوێنێکی نیمچەجێگیر بڵاودەکرێتەوە و ناوی نووسەرەکەی لەسەر دانانری چونکە زمانحاڵی ڕۆژنامەکەیە.

هەروەها پێناسەیەکی تر بۆ سەروتار.

(وتارێکە سیاسەتی ڕۆژنامەکە دەردەخات سەبارەت بە لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی هەواڵ و ڕووداوی ڕۆژانە).

کاری سەروتار بەگوێرەی سروشتی ئەو کۆمەڵگایەی کە ڕۆژنامەکەی لێدەردەچێ جیاوازە بۆ نموونە لە کۆمەڵگا لیبراڵییە دیموکراتییەکاندا سەروتار دەربڕی بۆچوونی خاوەنی ڕۆژنامەکەیە ئیتر تاك بێت یان کۆمەڵێك یان پارتێکی دیاریکراوبێت.

بەڵام لە وڵاتە سۆشیالیستەکان یان کۆمەڵگا تازە پێگەیشتووەکان سەروتار بۆچوونی سیاسەتی دەوڵەت یان پارتی دەسەڵاتدارە لێرەدا سەروتار ڕۆڵی پڕوپاگەندە دەبینێ بۆ سیاسەتی دەوڵەت. ئەوەی سەروتار دەنووسێ سەرنووسەر یا نوسەرێکی گەورەیە لە ڕۆژنامەکەدا لەوانەی کە جێگەی بڕوای سەرنووسەری یان خاوەنی ڕۆژنامەکەن.

سەروتار دەربری ڕاوبۆچوونی تێکرای ڕۆژنامەکەیە نەك تەنیا بۆچوونی نووسەر گەر سەرنووسەریش بێت.

## ئامانجەکانی سەروتار

(تۆماس بیری) تێڕوانینی وایە کە سەروتار کۆمەڵێك ئامانج بە دەستدەهێنێ گرنگترینیان ئەمانەن:

١. ڕوونکردنەوەی بۆچوونی ڕۆژنامەکە بەرامبەر ئەو راو سەرنجانەی کەلای جەماوەر گرنگە.
٢. لێدوان لەسەر هەواڵ و ڕووداو پیشاندانیان بە خوێنەر لەگەڵ پێشکەشکردنی بۆچوونی (سەرنج) و هەڵوێستی ڕۆژنامەکە.
٣. ئامادەکردنی خوێنەر بۆ وەرگرتنی هەڵوێستیکی بایەخداری دیاریکراو، پێشوەخت بەرامبەر مەسەلەیەك یان ڕووداوێك کە لە داهاتوودا ڕوودەدات.

## تایبەتمەندێتیی سەروتار

سەروتار ژمارەیەك تایبەتمەندێتی خۆی هەیە کە تایبەتمەندی لە هونەرەکانی تری ڕۆژنامەنووسی جیای دەکاتەوە لەوانە:

١. نووسەری سەروتار (زۆر جار سەرنووسەر دەینوسێ) باسەکەی وەسف و شیکاری و ڕاڤەی بابەتێکە لە بابەتە گرنگەکان لە چوارچێوەی دەربڕینی سیاسەتی ڕۆژنامەکەدا.
٢. زۆر جار سەروتار شوێنێکی جێگیر و دیاریکراوی لە لاپەڕەی یەکەمدا هەیە بە مەبەستی دەرکەوتنی.
٣. نووسەر زۆرجار مەسەلەیەك هەڵدەبژێریت کە لای ڕای گشتی بایەخی هەیە بۆ ئەوەی لە ڕێگای شیکردنەوەوە ئەو مەسەلەیە بە خوێنەر پێشکەش بکات.
٤. زۆربەی جار وتاری ڕۆژنامەنووسی ناونیشانی جێگیر هەیە، بەڵام سەروتار بە گوێرەی بابەتەکە دەگۆڕێت و لە هەندێ ڕۆژنامەدا بەناوی سەروتار دەنووسرێت.



## خاسییەتەکانی (سیفەتەکانی) نووسەری سەروتار

١. دەبێت خاوەنی هەستی وردی ڕۆژنامەنووسی بێت و ئارەزووی لە بە شوێنکەوتنی ڕووداوە هەنووکەییەکانی دەوروبەری هەبێت.
٢. هەستێکی شیکاری هەبێت کە بواری بداتی ڕووداوەکان هەڵسەنگێنێ و بتوانێ ڕابردوو ببەستێتەوە بە داهاتوو و، بۆچوونی بۆ داهاتوو هەبێت.
٣. خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی فراوان بێت و خوێنەرێکی باشی بابەتی جۆراوجۆر بێ بۆ ئەوەی بتوانێ بەو ڕۆشنبیرییەی حوکمی پتەو سەرنجی ڕاستگۆیانەو گونجاو دەربڕێت.
٤. دەبێ خاوەن هەستێکی ڕەخنەگرانەی تیژ بێت و توانای ئاراستەکردنی ڕەخنەی بنیادنەرانەی هەبێت بۆ پێشنیازکردنی دانانی چارەسەر بۆ کێشەکانی ناو کۆمەڵگادا.
٥. نووسەری سەروتار ڕەچاوی ئەوە بکات کە بۆچوونی ئەو ڕۆژنامەیە یان ئەو گۆڤارەی کە بۆی دەنووسێ دەردەبڕێت نەك بۆچوونی خۆی.
٦. دەبێت نووسەری سەروتار ڕاستگۆو ڕوون بێت لەدیاریکردنی مەبەستی لە نووسینی ئەو بابەتەی کە باسی دەکات.
٧. ئازا بێت لەکاتی باسکردنی گشت بابەتەکاندا (سیاسی و ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی).
٨. توانای ئەوەی هەبێت کە خوێنەری ڕۆژنامەکەو گۆڤارەکەی کە سەروتاری بۆ دەنووسێ تێبگەیەنێ.
٩. دەبێت توانای بەئاگابوونی لە ڕووداوەکان و خوێندنەوەی ورد بۆ بارودۆخەکە هەبێت.

## جۆرەکانی سەروتار

١. **سەروتاری لێکدەرەوە:**

ئەو وتارەیە کە ڕاڤەی هەواڵەکە یان ڕووداوەکە دەکات و ڕەهەندەکانی ڕووندەکاتەوە و پێویستە بابەتیانە بنووسرێت و دوورکەوێتەوە لە هەڵوێستی پێشەکییانە و تەنها کارەکەی لێکدانەوەی هەواڵەکە دەبێت.

٢. **سەروتاری زۆرانبازی:**

ئەو وتارەیە کە پێشوەخت بۆچوونە خۆی دەردەخات و هەوڵی داسەپانی ئەو هەڵوێستە بە سەر خوێنەردا دەدات، شێوازی ململانێ دەگرێتەبەر و پێشەکی بەرپەرچی بۆچوونەکانی بەرامبەر دەداتەوە و لە نووسیندا شێوازی (خطبة) بە خۆوەدەگرێ.

٣. **سەروتاری پێشبینیکردن:**

ئەو سەروتارەیە کە هەڵدەستێ بە نیمچە ئاشکراکردنێکی ئەنجامی چاوەڕوانکراو کە لەوانەیە لە داهاتوودا ڕووبدات لەسەر بنەمای زانیاری نووسەری وتارەکە بە ڕاستی ڕووداوەکە وە دەرکردنی بە سروشتی ئەو هێزەی کە توانای پێشبینیی ڕووداوێك لە داهاتوودا دەکات. ئەم نموونە وتارە ڕۆژنامە بلاوی دەکاتەوە کاتێك کە دڵنیا بوو لە زانیارییەکانی و توانای بۆ پشکنینی ڕووداوەکە و ئاراستەکانی کە ڕۆژگار دەریدەخات.

## ڕووخسارەکانی سەروتار

١. تایبەتمەندبوونی نووسەری سەروتار بە گوزارشتی سیاسەتی ڕۆژنامەکە واتە ناتوانێت دژی سیاسەتی ڕۆژنامەکە بنووسێت لە کاتێکدا نووسەری وتاری ڕۆژنامەنووسی و شیکاری و ڕەخنەگرانە و ستوونی پابەند نابن بە سیاسەتی ڕۆژنامەوە..



٢. سەروتار ناوی نووسەرەکەی لەسەر دانانرێ چونکە گوزارشتی بۆچوونی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەکەیە نەك نووسەرێکی دیاریکراو، بەڵام وتارە ڕۆژنامەنووسییەکانی تر ناوی نووسەرەکانی لەسەر دادەنرێ.

٣. سەروتار زۆر جار شوێنی جێگیر و ناونیشانی جێگیری هەیە، بە ڕێکوپێکی بلاودەکرێتەوە هەروەکو ستوونی ڕۆژنامەنووسی (هەندێ جۆری وتاری شیکاری نووسەرە گەورەکان بە شێوەیەکی ڕێکوپێك بلاودەکرێتەوە لە ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی هەفتەدا، بەڵام وتارەکانی تری شیکاری و ڕەخنەگرانە شوێنی جێگیر نییە و بلاوناکرێتەوە تەنها بە گوێرەی ئارەزوو و توانای نووسەرەکەی نەبێت.)

٤. پێویستە نووسەری سەروتار توانای نووسینی قایلکەرانەی هەبێت زیاتر لە نووسینی ڕاگەیاندنی.

سەروتاری ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە ٤٠٥٢ لە ٢٠٠٦/٨/٢١

**دادگاییکردنی مێژوویەکی ڕەش**

ئەمڕۆ ٢١ /٨ / ٢٠٠٦ دادگایی کردنی ترسناکترین بڕگەی زەمەنی لە مێژووی شۆفێنییەتی عێراق و عەرەب دەستپێدەکات، دڕندەترین دەسەڵاتی سەدەی بیست ڕووبەڕووی دادگا دەکرێتەوە کە پرۆسەی بەدناوی ئەنفالی کردە بەردەبازی جینوسایدی گەلی کورد لە عێراق. ئەمڕۆ ئەو دڕندانە دادگایی دەکرێن کە ژمارەی زۆر سورهێنەر یان لە مێژووی قەتڵ و عامی مرۆڤایەتی تۆمارکرد، بێسەر و شوێنکردنی ١٨٢ هەزار مرۆڤ و خاپوورکردنی (٤٥٠٠) دێ و چەندین ژمارەی ترسناکی دیکە، بۆیە ئەمڕۆ یەکێك لە خەونە دێرینەکانی گەلەکەمان بەدی دێت کە ساڵانێکی زۆر بوو بە حەسرەتەوە چاوەڕێمان دەکرد بۆ ئەوەی ئەو تاوانبارە گەورانە بە زەلیلەوە بخرێنە نێو قەفەسی زیندان و بە سزای عادیلانەی خۆیان بگەیەنرێت لە ساڵی ١٩٨٨)ەوە خەڵکی کوردستان و سەرکردایەتییە سیاسییەکەی نێوەندو کۆڕو کۆبوونەوەی دنیا نەما، ئەو زوڵمە گەورە نەتەوەییەی کوردی پێ نەگەیەنن،

زۆر لەو بەڵگەو دۆکیومێنتانەی ئەو تاوانە گەورەیە دەسەلمێنن، هەمیشە لەسەر مێزی کۆبوونەوەو پەیوەندییە سیاسی و دیپلۆماسییەکان ئامادەبوون، بەڵام کەناڵی ڕاستەقینە بۆ تەوزیفکردنی شایەتی شایەدەکان و بەڵگەو دۆکیومێنتەکان، هۆڵی دادگاکەی ئەمڕۆیە کە لە سەرەنجامەکەیدا دەتوانین بیکەینە دەستکەوتێکی یاسایی بێ تاوانی جینۆساید بناسرێ و کۆمەڵی نێودەوڵەتیش دانی پێدابنێت، بەڵگە یەکلاکەرەوەکانی ئەو تاوانە گەورەیە، ئیجگار زۆرن و بەپێی سەرچاوە ئاگادارەکانیش ئامادەکارییەکی باش کراوە بۆ سەلماندنی تاوانەکە بە سەر ئەنجامدەرانی، بۆیە دەتوانین لە ئێستاوە بە گەشبینییەوە لە دادگاییەکە بڕوانیین بەڵام ئەرکێکی نەتەوەیی و نیشتمانی هەموولایەکمانەکە کە چاودێرێکی وردبین بە سەر دانیشتنەکانی دادگاییەکە و هەریەکە لە شوێنی خۆمانەوە بە شێوازی جیاجیا پشتگیری لە ئیفادەی شایەدەکان و بەرگری پارێزەرەکانیان و ڕاستی و دروستی بەڵگەکان بکەین، چونکە ئەو دادگایکردنە تەنیا دادگایکردنی بێسەروشوێنکەرانی ١٨٢ هەزار مرۆڤی کورد نییە، بەڵکو دادگایکردنی مێژوویەکی ڕەشی دیکتاتۆریەت و جینۆسایدکەرانی گەلەکەمان و ئێمەو نەوەکانی پێش و پاش ئێمەش پەیوەندیدارن بە سەرەنجامەکەی.

سەروتاری ڕۆژنامەی خەبات ژمارە ١٨٨٦ لە ١٥ / ٨ / ٢٠٠٥

ڕوناهی

بەپێی قانوونی بەڕێوەبردنی دەوڵەت ئەمرۆ ١٥ /٨ / ٢٠٠٥ ڕەشنووسی دەستووری هەمیشەیی دەدرێتە کۆمەڵەی نیشتیمانی عێراق و دواتریش لە ناوەڕاستی مانگی ئۆکتۆبەر دەخرێتە بەردەم گەلانی عێراق بۆ قبووڵکردنی یان ڕەتکردنەوەی، کە لە قانوونی ناوبراودا باسی لێوەکراوە. لە بنەڕەتەوە دەستوور نووسین پرۆسەیەکی سەخت و بە کێشەیە، بە تایبەتی لە وڵاتێکی وەك عێراق کە لە نەتەوەو ئایین و مەزهەبی جودا پێکهاتووە و لەوەتەی دامەزراوە جۆرە یەکسانییەك لە نێوان پێکهاتنەکانیدا بوونی نەبووە. بۆ نووسینی دەستوورێك کە ماف و ئەرکەکانی هەمووان بە یەکسانی و بە پێی هەقیقەتی جوگرافی و مێژوویی لەخۆبگرێ و دابینی بکات، لیژنەی دەستووری لە پەرلەمانی عێراق پێکهات، بە تایبەتی بەم دواییە بۆ ئەوەی دەستوور مایەی قبووڵکردنی هەموو لایەك بێت، ژمارەیەك



ئەندامی عەرەبی سوننەی بۆ زیادکرا. پاش کارکردنی بەردەوام ١٨ خاڵ بە هەڵواسراوی مانەوە، بۆ چارەسەرکردن و دۆزینەوەی جۆرە تەوافقێك، سەرۆکی کوردستان بە سەرۆکایەتی وەفدێکی باڵای کوردستانی بە ٥ فایلی هەستیار و گرنگەوە سەردانی بەغدای کردو لەگەڵ سەرکردە سیاسییەکانی عێراق کۆبوونەوە لە دوای کۆبوونەوە دەکەن. بە پێی زانیاری هەندێك سەرچاوەی نزیك لە کۆبوونەوەکان زۆربەی خاڵە ناکۆکەکان چارەسەرکراون، بە تایبەتی پرسەکان وەك ناسنامەی دەوڵەت، کە بوو بە کۆماری عێراقی فیدراڵ و دابەشکردنی سەروەت و سامانی وڵات و کەرکوك کە دەبێ تا مانگی دیسەمبەر بارودۆخی شێواندراوی بە پێی مادەی ٥٨ ی قانوونی بەڕێوەبردنی دەوڵەت ئاسایی بکرێتەوە، ئەمە وێرای ئەوەی کە پرۆسەیەکی دوورو درێژیشە، هەروەها پرسی پێشمەرگە ساغ کرایەوە، کە تایبەتە بە هەرێمی کوردستان و بەشێك نییە لە سوپای عێراقی، هەرچەندە بۆ مەسەلەکانی دیکەی وەك مافی چارەنوس گفتوگۆکان و هەوڵەکان بۆ گەیشتن بە تێگەیشتنێکی هاوبەش بەردەوامن و بە پێی هەواڵی ئاژانسەکان بێت، شەمەندەفەری دەستوور لە وێستگەکانی کۆتایی نزیك کەوتۆتەوەو تەنها سێ خاڵی جەوهەری کێشەی لەسەر ماوە. پاڵپشت بۆ هەوڵەکانی سەرکردایەتی سیاسی کوردستان، دوێنێ لە سەرانسەری کوردستان. ئەو کوردستانەی لەو نەخشەیە خۆی دەنوێنێ کە پێشکەشی لیژنەی دەستوور کراوە ڕێپێوانێکی جەماوەری هێمنانەی بەرفراوان بەڕێوە چوو بۆ جێگیرکردنی داخوازی و مافەکانی کوردستان لە دەستووی هەمیشەیدا بە دیاریکردنی مافی چارەنووسیشەوە، کە مافێکی ڕەوای گەلی کوردستانە خۆی بڕیار لە چارەنووسی خۆی بدات. ئەگەر خەڵکانێکیش هەبن لە عێراق بەو تەرحەی کورد ناڕازی و سەرگرانن.کە خۆی لە یەکێتی ئارەزوومەندانەی نێوان کورد و عەرەب دەبینێتەوە، با چاوەڕوانی عێراقێکی یەکگرتووش نەکەن، چونکە لە سایەی خۆبەڕێوەبردندا لە کوردستان نەوەیەك پێگەیشتووە دروشمی سەربەخۆیی بەرز کردۆتەوە، ڕێژەی دەنگەکانی هەڵبژاردنی کانوونی دووەمی ڕابردوو و ڕێپێوانە هێمنانەکەی دوێنێی جەماوەری کوردستان بە سەرپەرشتی بزووتنەوەی ڕاپرسی کوردستان نامە و ئاماژەیەکی ڕوونە و پرسیار هەڵناگرێ.

## سەرەتا

ئەمڕۆ ستوونی ڕۆژنامەنووسی بە هونەرێکی بایەخداری ڕۆژنامەنووسی دادەنرێت پاش دەرکەوتنی نووسینی ستوون خوێنەران هەموو بەیانییەك تامەزرۆی ستوونەکەیانن.

دەتوانین وا تەماشای ستوونی ڕۆژنامەنووسی بکەین کە هەمیشە میوانی لاپەڕەکانی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانە ئەم جۆرە هونەرە پەڕەی تایبەتی نییە بەڵکو لە زۆربەی پەڕەکاندا بە گوێرەی بابەتی پەڕەکە بڵاودەکرێتەوە و لاپەڕەی وەرزشی ستوونێکی وەرزشی لەخۆدەگرێ و لاپەڕەی هونەری ستوونێکی هونەری لەخۆدەگرێ.

زۆر لە نووسەرانی ستوون لە جیهانی ڕۆژنامەنووسیدا بە هۆی نووسینی ستوونەوە دەرکەوتن، بە شێوەیەك کە پێگەیەکی جەماوەرییان هەیە، لە نووسەرانی وتار و ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسی زیاتر ناسراون و، ڕۆژنامەکان بۆ زیاد فرۆشتنی ژمارەکانیان پشتیان پێدەبەستن، بە جۆرێك کە خوێنەر لەنێو ڕۆژنامەکاندا بۆ نووسەری خۆیان دەگەڕێن.

بەو شێوەیە ستوون دینامیکییەت و زیندوێتی بە کاری ڕۆژنامەنووس بەخشی، کە پێشتر ڕۆژنامەکان ئەو مەسەلەیان بەخۆوە نەبینیبوو. لە لایەکی ترەوە زۆر لە ڕۆژنامە فرەبڵاوەکان ستوون لە ڕۆژنامەنووسە ناودارەکان دەکڕێت بەرامبەر برە پارەیەکی زۆر لە پێناوی فرۆشتنی ژمارەیەك زیاتر لە ڕۆژنامە و ڕاکێشانی ژمارەیەکی زیاتر لە خوێنەر.



## پێناسەی ستوونی ڕۆژنامەنووسی
## Difintions of Columns

دەتوانین ستوونی ڕۆژنامەنووسی بەم شێوەیە پێناسە بکەین:

هونەرێکی ڕۆژنامەنووسییە ئامانجی نیشاندانی زانیارییە یان باسی سەرنجی نووسەرەکە دەکات و شوێنی دیاریکراوی خۆی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا هەیە.

هەروەها پێناسەی تری ستوون:

(ڕووبەرێکی دەستنیشانکراو و دیاریکراو و نەگۆڕە لە شوێنێکی دیاریکراوی ڕۆژنامەکەدا بە یەکێ لە نووسەرە گەورەکان دەبەخشرێ و ناونیشانی خاوەنەکەی دیارەو ناوی نووسەرەکەی لەسەر دەنووسرێت.

پێناسەیەکی تر:

(چەشنێکە لە چەشنەکانی بابەتی ڕادەربڕین لە ڕۆژنامەدا یەك کەس یان چەند کەسێك دەینووسێت لە ژێر ناونیشانێکی جێگیردا و ناوی نووسەرەکەی هەڵدەگرێت وە بە شێوەیەکی دەوری ڕۆژانە بێ یان هەفتانە لە شوێنێکی دیاریکراودا دەنووسرێ و بۆچوونێك یان ئەزموونێك یان شارەزاییەکی خاوەنەکەی نیشان دەدات).

لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی (Column) بۆ ستوونی ڕۆژنامەنووسی بەکار دەهێنرێ. ئەم وشەیە ستوونی باڵەخانە دەگەیەنێ و ستوونی ڕۆژنامەگەریش وەك ستوونی باڵەخانەیە لە باری شوێن و ئەرکەوە.

لە ڕۆژنامەگەری ئینگلیزی و ئەمریکیدا دەستەواژەی (Columnist) بۆ نووسەری ستوون بەکاردەهێنرێ. واتە (ستوونووسی ڕۆژنامەنووسی) ئەم نازناوە تەنها بۆ ڕۆژنامەنووسە بەناوبانگەکانی ستوونووسیدا دەرکەوتوون ئەو نووسەرەش کە لەو بوارەدا ئێجگار بە ناوبانگ بێ ئەوا بە (World Famous Columnist) واتە بە ستوونووسی بەناوبانگی جیهان دەناسرێ.

## خەسڵەتەکانی ستوونی ڕۆژنامەنووسی

١. ستوونی ڕۆژنامەنووسی بریتییە لە باسکردن یان گێڕانەوە یان شیکردنەوەی مەسەلەیەك کە لەو ڕوانگەیەوە نووسەر بۆچوونی خۆی دەردەبڕێ و بە شێوەیەکی واقیعیانە و ڕاستگۆییانە و تایبەتمەندییانە و لە ڕێگای یادەوەری و ئەزموونەکانی خۆیەوە نووسەر ئامۆژگاری خوێنەر دەکات. ستوون لە ڕێگای کەسێکی لێهاتوو لە باری هونەری ڕۆژنامەنووسی و خاوەن ئەزموون لە ژیاندا یان لە بوارێکی زانستی مرۆڤایەتیدا، دەنووسرێ.

٢. ستوونی ڕۆژنامەنووسی بوارێکی فراوان لە مەسەلەی جیاواز لە ناوەڕۆکدا بەخۆوەدەگرێ. بۆیە دەبینین لە سیاسەتی نێودەوڵەتییەوە دەستپێدەکات تا دەگاتە سیاسەتی ناوخۆیی و مەسەلەی ئارەزووەکان و کات بەسەربردن.

## تایبەتمەندییەکانی ستوونی ڕۆژنامەنووسی

ستوونی ڕۆژنامەنووسی چەند تایبەتمەندییەکی هەیە گرنگترینیان ئەمانەن:

١. ستوون دوو ناونیشانی هەیە یەکێکیان جێگیرە و ئەویتریان گۆڕاوە، ستوون نووس ناونیشانی جێگیر هەڵدەبژێرێ بۆ ستوونەکەی وەکو (بەدەنگی بەرز) و بۆ هەر ستوونێك کە دەینووسێ ناونیشانێکی تر کە دەگونجێ لەگەڵ ئەو بابەتەی کە باسی دەکات هەڵیدەبژێرێت.

٢. مەرج نییە ستوون نووس یەکێك بێت لە کارمەندانی ڕۆژنامەکە، بەڵام پێویستە نووسەرێکی ئەزموونداری شارەزابێت لە تەکنیکی ڕۆژنامەنووسیدا و زۆر جار ڕۆژنامەکان کەسایەتییە دیارەکانی ناو جیهانی ڕۆژنامەنووسی هەڵدەبژێرن بۆ نووسینی ستوون.

٣. گەر زۆر جار هەواڵ و ڕاپۆرت و چاوپێکەوتن و ڕاپرسی و ڕیپۆرتاژ لاپەڕەی جێگیریان هەبێت ئەوا ستوون ناو دەبرێت بە میوانی لاپەڕەکان تەنها لاپەڕەی یەکەم نەبێت ئیتر زۆربەی لاپەڕەکانی تر ستوونی ڕۆژنامەنووسی لەخۆدەگرێت.



٤. لە ئەنجامی توێژینەوەکاندا دەرکەوتووە کە خوێنەران هۆگری ستوونێك دەبن کە یەکێ لە ڕۆژنامەنووسان دەینووسن، ڕۆژنامە یان گۆڤارەکان لەپێناو خوێندنەوەی ئەو ستوونە ڕۆژنامەکە دەکڕن.

## جۆرەکانی ستوونی ڕۆژنامەنووسی
## Kinds of Column

١. ئەو ستوونەی کە زۆربەی جار بایەخ بە کاروباری گشتی دەدات و زۆربەی مەسەلەی ڕامیاری یان ئاسایشی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و زانستی یان هونەری و وەرزشی، پیشان دەدات، بەڵام لە گۆشەیەکەوە کە لای خوێنەر بایەخداربێ.

٢. ئەو ستوونەی کە بایەخ بە ڕەخنەی کۆمەڵایەتی توند و پتەو دەدا پشت بە گاڵتەجاڕی (پێکەنینی گریاناوی) دەبەستێ دیاردەیەکی پێکەنیناوی و ناخەکەی ڕەخنەی توندی تیابێت.

٣. ستوونێك کە باسی پرسیار یان ئەو نامانەی کە لە لایەن خوێنەرانەوە دەگاتە نووسەر و پاشان نووسەر وەڵامی دەداتەوە یان لێدوانی لەسەر دەکات یان تەنها بڵاوی دەکاتەوە.

٤. ستوونێك کە گفتوگۆیەکە نووسەر دروستی دەکات، ئیتر بە زمانی خۆی بێت یان لە زمانی کەسێکی ترەوە کە بە شێوەی گفتوگۆ لە گەڵ خود واتە (مەنەلۆج) دەگرێتەوە یان شێوەی گفتوگۆ لەگەڵ کەسانی تر دەگرێتەوە.

٥. ستوونێك کە هەڵدەستێت بە وەسفکردنی دانسقە و جیاوازییەکا ن بە ئامانجی کات بەسەربردنی خوێنەران.

## چەشنەکانی ستوونی ڕۆژنامەنووسی

**Shapes of Columns**

چەشنی جۆراوجۆری ستوونی ڕۆژنامەنووسی هەیە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە گرنگترینیان ئەمانەن:

**١. ستوونی کاروباری گشتی:**

لەم جۆرە ستوونەدا ڕۆژنامەنووس باسی کاروباری گشتی ڕامیاری و ئاسایشی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و، لە زۆربەی کاتەکاندا شێوازی شیکردنەوە بەخۆوەدەگرێ.

**٢. ستوونی ڕووداوە هەنووکەییەکان:**

ڕۆژنامەنووس باسی ڕووداوە هەنووکەییەکان ئەمڕۆ دەکات ئیتر ڕامیاری بێت یان ئابووری یان ڕۆشنبیری و ڕۆژانە ئاگاداری هەموو هەواڵێکە بۆ زانینی نوێترینیان بۆ ئەوەی ستوونی ڕۆژنامەنووسی لەسەر بنووسێت.

**٣. ستوونی خەیاڵ و تێڕامان:**

ئەم جۆرە ستوونە زۆر لە شێوەی ئەو خەیاڵانە دەچێت کە ئەدیبان لەمەڕ مەسەلەکانی ژیان دەینووسن و بە گوزارشتێکی سادە و سەرنجڕاکێش دەریدەبڕن.

**٤. ستوونی گاڵتەجاڕی:**

زۆر لە نووسەرانی ستوون هەن ڕەخنە لە گشت لایەنەکان ژیان دەگرن بە شێوازی گاڵتەجاڕی ئەوان گاڵتە بەکاردەهێنن بۆ ڕاکێشانی خوێنەران و ڕابواردنیان بەو شێوەیەی ڕەخنەو گاڵتەجاری ئامانج بە دەست دێنێت.

**٥. ستوونی تایبەتمەند:**

ئەم جۆرە ستوونانە بابەتی دیاریکراو و تایبەتمەند لە خۆدەگرێ، وەکو ستوونی وەرزشی لە لاپەڕەکانی وەرزشی نووسەر مەسەلە وەرزشییەکان باس دەکات لە دەرەوەی ئەم باسە هیچ شتێکی تر باس ناکات.



**٦. ستوونی نامەی خوێنەران:**

باسی نامەی خوێنەران دەکات و وەڵامی پرسیارەکانیان دەداتەوە و بەشداری ڕاوبۆچوونیان دەکات ئەم جۆرە ستوونە ڕایەڵی پەیوەندی نێوان ڕۆژنامەو خوێنەرانێتی.

**٧. ستوونی ئاخافتن:**

نووسەر لەم جۆرە ستوونەدا شێوازی دیالۆگ بەکاردەهێنی. واتە شێوازی پرسیارو وەڵام لە میانەی خستنەرووی بابەت و ڕەخنەگرتن لێی.

**٨. ستوونی ڕۆژانە:**

نووسەر لەم ستوونەدا ژیانی ڕۆژانەی خۆی دەخاتە ڕوو و دەستنیشانکردنی ڕووداو و دیاردە هەموو جۆرەکانی دەوروبەری دەکات.

## تایبەتمەندیی نووسەری ستوونی ڕۆژنامەنووسی

ستوونی ڕۆژنامەنووسی ئەو نووسەرانە دەینووسن کە شارەزاییەکی قووڵی ڕۆژنامەنووسییان هەیە لەوانەیە لە ناوەندی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەکەدا بێت، هەروەها ڕۆژنامە هەیە کە ستوون دەدا بە دەرەوەی دەستەی نووسەران بینووسێت، زۆر جار ستووننووس تایبەتمەندی لە چەندین ڕۆژنامە بڵاودەبێتەوە هەندێ ئاژانس هەن (هەروەکو لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هەیە) کارەکانیان لە بواری کڕین و فرۆشتنی ستوونی ڕۆژنامەنووسی کەلە نووسەرەکاندایە. ستوونووس ئازادە لە هەڵبژاردنی بابەت و گۆشە و شێوازی چارەسەرکردن و بواری هەیە بۆ چارەسەرکردنی بابەتەکە بە شێوازی تایبەتی و چ درامایەکی سووک بێ یان گاڵتەئامێز و ڕەخنەیی و سەرگەرمی درەخشاوە یان لە سەرخۆ بێ.

## شێوازی ستوونی ڕۆژنامەنووسی
## Styles of Columns

ستوونی ڕۆژنامەنووسی دیارترین تەکنیکی ڕۆژنامەنووسییە لە ڕۆژنامەگەری نوێدا کە شوێنی گفتوگۆی ڕۆژانە دەگرێتەوە لە نێوان ڕۆژنامە و جەماوەردا زۆر جار شێوازێکی میللی بە خۆوەدەگرێ چونکە مەسەلەی جیدی و گاڵتەجاڕی و تەنزی کۆمەڵایەتی بە خۆوە دەگرێ. ستوونی ڕۆژنامەنووسی یەکێکە لە شێوازە خۆشەکانی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا لای خوێنەران. خوێنەر ڕادەکێشی بۆ بیرکردنەوەو زانینی باری سەرنجی دیاریکراو، تا بتوانێت سوودی لێ ببینێت بۆ چالاکییە فیکرییەکانی، هەروەها زیاترین کاریگەری و توانای هەیە لە دروستکردنی بریارو پەیڕەویکردن لای ئەو خوێنەرانەی کە دەیخوێننەوە و بڕوایەکی پێشینەیان هەیە کە ئەو ستوونە شتێکی نوێیە سەرەڕای ئەوەش زۆر بە گەرمی ئەرکی گەیاندن و بەردەوام بوون لەگەڵ خوێنەردا جێبەجێ دەکات. ستوون لە پێکهاتەو سرووشت و ئەرك و مەبەست لە هونەرەکانی دیکەی ڕۆژنامەنووسی جیایە بۆیە دەبینین ڕێساو بنەمای خۆی هەیە و، نووسەر باس و شیکردنەوەی خۆی لە بواری زمان و وێنەدا چڕدەکاتەوە و، زمانێکی ناسك و ئاماژەپێکردنێکی زیرەکانەی ئەوتۆ بەکاردەهێنی کە لە هێمای شاعیر دەچێ. بۆیە دەبینین کەسایەتی خودی نووسەر دیارە.

ستوونی ڕۆژنامەنووسی لە میانەی ئەو بابەتانەی کە پێشکەشی دەکات و سروشتی کاریگەری و جۆری نووسینەکەی شوێنێکی جیاکراوە داگیر دەکات لە لاپەڕەکانی ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا.

نووسەرانی ئەم بوارە بە ئەستێرەکانی بواری فیکرو ئەدەب و ڕۆشنبیری و بە سەرکردەی بۆچوون لە کۆمەڵ دادەنرێن، لێرەدا مەبەستمان ڕۆشنبیری ئەکادیمیانە یان زانیارییەکی دیاریکراو لە بوارێکی زانستی مرۆڤایەتیدا نییە، بەڵکو مەبەستمان ڕۆشنبیرییەکی سەرانسەرییە کە دەبێ لە نووسەردا هەبێ، بە جۆرێك لە بواری جۆراوجۆری زانست و هونەر و هەر دیاردەیەکی مرۆڤایەتی، جۆرە زانیارییەکی هەبێ، و حەز لە زانست بکات و، زانیارییەکی باشی لە بواری سیاسەت و ئابووری و هونەر و وەرزش و....هتد، هەبێ.

مەبەستمان زانیارییەکی تایبەتمەندی ورد نییە چونکە ئەم کارە هیچ کەسێك ناتوانێ هەیبێت بەڵکو مەبەستمان ئەو گشتییەیە کە بواری دەدا بە نووسین و تێگەیشتن و هۆشیاری تەواوەوە بنووسێ. بۆیە ستوونی ڕۆژنامەنووسی ئەمڕۆ بووە بە چەشنێك یان توخمێکی ڕۆژنامەنووسی و تایبەتمەندێتی و مێژووی خۆی هەیە و لە جیهانی ئەمڕۆی ڕۆژنامەنووسیدا ئاماژە دەکرێ بە (ۆڵتەر لیمان و کەسەندرا و فرانك کنت و دیفید لۆرنس و بیتەر ئەدیسۆن و مارکیز جایلدز و دورسی سمبسون و ئەوانی تر) لە مامۆستایانی ستوونی ڕۆژنامەنووسین لە ڕۆژنامەگەری جیهانیدا.

لەوانەیە خوێنەر ناوی زۆر لە نووسەرانی عەرەب بزانێ کە لە ساڵانی سییەکانی سەدەی پێشووەوە لە ڕۆژنامە عەرەبییەکاندا دەرکەوتوون و هەروەها هەندێ لە ڕۆژنامە کوردییەکانیش خوێنەری تایبەتی خۆی هەیە بە هۆی ستوونی ڕۆژنامەنووسییەوە کە لایەن کەستێکی ناودارەوە دەنووسرێ..وە بە شێوەیەك لە شێوەکان ئاراستەیەکی زانراویان لە ستوونی ڕۆژنامەنووسیدا دروستکردووە کە دەگونجێ لە گەڵ سروشت و ڕوپێوە تایبەتمەندەکەی و بابەت و دیاردە و ئەو بیرۆکانەی کە چارەسەری دەکات.

ستوونی ڕۆژنامەنووسی لە لایەن نووسەرێکی لێهاتوو و زیرەك و گەرم و گوڕ لە دەربڕیندا، دەنووسرێ. ئەو نووسەرە زیرەکانە چاودێری ژیانی گشتی کۆمەڵگا دەکات، و بایەخ بە پسپۆڕی خۆی لە بواری نووسینی ڕۆژنامەگەریدا دەدات.

لەوانەیە ئەو نووسەرە بابەتی گاڵتەئامێز یان جیددی، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بنووسێ. ئەوەی لە نووسەرانی دیکە جیایدەکاتەوە، شێوازی نووسینەکەیەتی.

نووسەری ستوون هەستدارە زیاتر لەوەی زەینی بێت ئارەزووی زیاتر بەلای گوزارشتکردنەوە هەیە لەسەر هەلومەرجێك یان هەڵوێستێك ئەو زۆرینەی جار مەسەلەیەکی پەیوەست بە ژیان و گەرم وگور دەوروژێنی.

ستوونووس ستوونەکەی ئەدەبی بێت یان هونەری و کۆمەڵایەتی و ڕامیاری گەنجینەی ڕۆشنبیری و زانیاری خۆیی پیشان دەدات. ئەو زۆرترین ژمارەی خوێنەران دەدوێنێ و خوێنەریش ئارەزووی خوێندنەوەی ستوونەکەی دەکەن چونکە نووسینی ستوونەکە نزیکە لە باس و خەم و پێویستییە دەروونییەکانی ئەوانەوە و دەربڕی بیرۆکەیانە و کاردەکاتە سەر بیرکردنەوە یان ڕێکی دەخات یان گفتوگۆی لەگەڵدا دەکات یان شتی زیادی دەخاتە سەر.

لە نووسینی ستووندا ڕۆژنامەنووس پێویستی بە شارەزایی ئامرازی تەکنیکی ئەم بوارەیە. پێویستە نووسەر خاوەنی زمانێکی زیندوو ناسك وپڕ لە هەستکردن بە ژیان لە نووسینەکانیدا هەبێ. هەروەها پێویستە خاوەنی شێوازیکی گاڵتەجاری هەست پێکراوبێ بتوانێ وشەکانی وێنە و ڕەنگ لەگەڵ خۆیدا هەڵگرێ و تا دوا وشە سەرنجی خوێنەر ڕاکێشێ.

پێویستە نووسەر خاوەنی شارەزایی هونەری نووسینی ڕۆژنامەنووسی هەبێت و دەستووری بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەنووسی ڕێك بزانێ لە ڕوونی و دەرخستن و درەخشانەوەو خۆلادان لە پەند دادان و بەکارهێنانی زمانی نامۆو کەم وێنە و نەشاز وە بەکارهێنانی سادەیی و دوورکەوتنەوە لە نیگەرانی و لە ڕاستەوخۆیی و نزیك بێتەوە لە زمانێك کە لە ئاستی داهێناندا بێت. زمانی لاواز هیچ فیکرێکی بەهێز لەخۆناگرێ بۆ خوێنەر بۆیە ئەو شوێنەی کە دیاریکراوە بۆ ستوونی ڕۆژنامەنووسی دەبێت نووسەر فێر بێت بەهرەی هەبێت لە کەمکردنەوەی وشەکانی و چڕکردنەوەی وێنە و دەستەواژەکانی و ئاماژە و بە هێماکانی بکات بە شێوەیەك کە بیرۆکەیەك لەخۆبگرێت و بیخاتە چوارچێوەیەکی جوان و داهێنەرانە و کە کەسێتی نووسەرەکەی بە دەمامکەوە تیادا دیاربێت. هەروەکو شۆخێك کە چارشێوە جوانتری بکات و سەرنجی خەڵکی بۆ ڕاکیشی.

دەبێت ستوونووس لە هەموو سەرچاوەکانی هێز بە ئاگا بێت کە زمان و شێواز و خەیاڵ و بیرکردنەوەو وزەی دروستبوونی بیرۆکەکە بە گشتی و بە چەشنێکی ڕێکخراو



جوان دەگرێتەوە دەبێ بۆچوونی هەبێت بۆ خۆی و شێوازەکەی لە کەسانی تری جیای دەکاتەوە.ئەمەش لەگەڵ وتەی نووسەری فەرەنسی دەگونجێ کە دەڵێ: (بۆفون) شێوازی نووسینی خودی مرۆڤەکەیە.

لەبەر ئەوەی نازناوی ستوونووس بەو ڕۆژنامەنووسانە ناوترێت کە بەختی خۆیان لەگەڵ نووسینی ستووندا تاقی دەکەنەوە چونکە نەریتی تایبەتی هەیە و بەو نازناوە ناو دەرکردن.

دەبێت نووسەر ماوەیەکی درێژ بەسەر بەرێت لە نووسینی ستوون کە چەندین ساڵ لەم بوارەدا کاری کردبێ و ناوەکەی قورسایی خۆی هەبێت لە ناوەندی ڕۆژنامەنووسی لە ناوەندی خوێنەراندا. بێجگە لە بوونی سیفات و پێوەر و ڕێساو بنەمای هونەری کە پێوەری نووسینی ستوونی ڕۆژنامەنووسییە. ستوونی ڕۆژنامەنووسی دوا قۆناغی پێگەیشتن و شارەزایی ڕۆژنامەگەرییە لە بەر ئەوە لێپرسراوییەکی لەو ستوونانە نادرێ بە ڕۆژنامەنووس تەنها دوایی تێپەڕبوونی ساڵانێکی دوور و درێژ لە کاری ڕۆژنامەنووسیی قورسدا. ڕێگای نووسینی ستوونی ڕۆژنامەنووسی لە بیرۆکەیەکی ڕەسەنەوە یان تواناو لێهاتوویی نووسەر بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکە قورسە دەستپێدەکات بە جۆرێك کە خاوەنی ستوون زانیاری پێویستی لە بوارێکدا وەك بواری سیاسی یان وەرزشی یان هونەری هەبێت.

هەندێ ڕۆژنامەنووس تێڕوانینیان وایە کە ستوونی ڕۆژنامەنووسی پەنجەرەی داهێنانە، بەڵام کارێکی سەختە. نووسەری ستوون پاڵێوراوە بۆ ئەوەی ببێتە ئەستێرەیەکی پرشنگدار لە بواری ڕۆژنامەنووسیدا، زیاتر لەوەی نووسەری هەواڵ یان پەیامنێر یان ڕاسپێر یان نووسەری ڕیپۆرتاژ و بەدواداچوون یان وتارنووس لە ڕۆژنامەدا بەم پلەیە بگات. نووسەری ستوون لە ڕۆژنامەدا کاروباری وەك ڕۆماننووس وایە، باس لە مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان دەکەن و خەڵکی قسەکانیان دووبارە دەکەنەوە تەنانەت ئەگەر ئەو نووسەرانە لە ژیاندا نەمێنن ئەوان هۆگری کۆمەڵایەتین بە شێوەیەك گەواهی بە گووتەکانیان دەدەن و گفتوگۆی کارەکانیان دەکەین هەتا دوای نەمانیانیش

له ژیاندا. ستوون نووس پێویستی به بەهرەی بەرز و ڕۆشنبیرییەکی بەرز و گەنجینەیەکی که والّا بۆ یادەوەری و چیرۆکی میللی و خەیاڵی فراوان و هەتاوەکو داستانەکانیش هەیه. چونکه ستوون نووس ڕۆژانه تێبینی دیاردە کانی ژیان و کۆمەڵ دەکا چونکه پێویستی پێیەتی هەروەها بەگیانی مرۆڤایەتی و دڵنیاییەوە ئەم سیفاتانەش له ژمارەیەکی کەمی ڕۆژنامەنووساندا هەن.

**ئاشتبوونەوە**

**مارکیز بەو پێودانگەیه دەدوێ**

حەبیب کەرکوکی

لەسەر سەکۆیەك وەستا که دەوری دراوە به داهێنەران به دەستی ئاماژەی بۆ دانیشتووان کردو دەستەواژەیەکی گووت که تێڕوانینی ئەدیبان هاوسەنگییەك هەبوو له بارستایەکەیدا (خۆماڵی بوون ڕێگایه بۆ جیهانیبوون) مارکیز ئەم وتەیەی له یەکێ له ڕۆژەکانی هاوینی ساڵی **١٩٨٣**دا گووت لەو کاتەدا که خەلاّتی نۆبلی بۆ ئەدەب وەردەگرت.

کێ ئەیەوێ وەکو مارکیز بێت با شەقام و کۆلاّنەکانی کەرکوك بگەڕێت به دوای چیرۆکەکاندا و بیگۆڕێ به شاکارێك و ئەدەبی جیهانی پێ دەوڵەمەند بکات و بەرز بێتەوە بەرەو ئاسۆیەکی فراوان له ناوخۆییەکەوە دەست پێبکات.

ناتوانین پێشبینی بکەین که مارکیزێکی تر له دایك دەبێت له کونجێکی تری ئەم جیهانەدا و به داهێنانێکی نوێوە چونکه بێ وێنه بوو له جۆری نووسنی ئەدەبیدا بەرامبەر بەوە ناتوانین پێشبینی بکەین که عێراق مارکیزی نییه یان مارکیزێکی عێراقی یان کەرکوکی نییه. چونکه له ڕاستیدا مارکیز هەیه و ئەتوانین له هەر مرۆڤێك مارکیزێك وێنا بکەین تەنها به ڕێزگرتن له ئەدەبەکەی و ڕەخنه بگرین دوور له ئارەزووی کەسی خۆمان تەنها لەبەر ئەوەی پێمان بڵێن ڕەخنەگر.



هاوڕێیان ئەدەب هاوڕێمانه وە ئەدیبان له خێزانەکانمان نزیکترە چونکه کاتێ که دەخوڵێینەوە له ناو دەشتی ئەدەبدا ناتوانین بگەڕێینەوە و واز له ئەدەب بهێنین و بڵێین ئێمه دەمانەوێ بگەڕێینەوە بۆ نائەدەبی. مانای ئەوەی فێربووین فەرامۆشی بکەین. بەلاّم مارکیز فێری نووسینی ڕۆمان بوو له خەڵکانی ترەوە مەبەستمان دایك و باوکی و خوشك و براکانی و ئەو خەڵکانەی که له ناویاندا دەژیا. پیاوێك که ناوی دەبەین به کارەساتەکانی ژیان وە پێویستە وەبیر خۆمانی بهێنینەوە که مارکیز وتی هەروەها ئەوەمان بیر نەچێت ئێمه تا ئێستا له ژیاندا ماوین هاوڕێیانم ناوخۆیی یان خۆماڵیبوون — خۆماڵیبوون ئەوە ڕێگەی بەرەو جیهانیبوونه بەم پێودانگەیه مارکیز دەدوێ.

**هەڵوێست**

**پێنووسی / ئەنیس مەنسور**

- هاوڕێ: هێمنم کردیتەوە؟ هاتیتەوە سەرخۆت؟

+ گەر ویستت تەمەنی ڕاستی ئافرەتێك بزانی له خوشکی مێردەکەی بپرسه.

- فرمێسك ئازار کەمدەکاتەوە، بەلاّم له ناوی نابات.

+ گەر منالێکت هەبوو ئەوا تۆ باوکیت گەر زیاترت هەبوو ئەوا ناوبژیوانی تۆپێنێکی دوراوی.

- ئامۆژگاری: گەر پیاو تەمەنی گەیشته ٤٠ ساڵ دەبێ دوو کچی تەمەن ٢٠ ساڵان مارە بکات.

+ لای ئافرەت: پیاوێکی دەوڵەمەندی ناشیرین پەسەندترە له پیاوێکی جوانی بێ سامان.

- هەموو کەس ئەوانەی خۆشدەوێت که یەکتریان خۆشدەوێت.

+ خۆشەویستی وەکو سورێژە وایە: زۆربەیان له تەمەنێکی درەنگدا تووش دەبن.

- عاشق هەمیشە کەرو کوێرە تا ژن دێنێ.
+ بەختەوەری لە ژیاندا: ڕێکەوت...لە زەماوەندکردنا زۆر کەمە.
- جیابوونەوە: لەکەیەکە، بەڵام لەوانەیە بژێت تیایدا.
+ ئەگەر باوکت گێل بوو ئەوا قەدەری خۆتە، بەڵام گەر ژنەکەت گێل بوو ئەوە بەڵایە.
- ئێمە لیرەین بۆ خەڵکانی تر ئەی خەڵکانی تر چی دەکەن بۆ ئێمە.
+ دایك هەرگیز بڕواناکات منالەکانی گەورەبووبن تەنانەت گەر منالەکانی منالیشیان هەبێت.
- دوژمنی ڕاستگۆ باشترە لە هاوڕێیەکی درۆزن.
+ هاوڕێیەتی وەکو پاپۆڕ وایە دوو هاوڕێی هەڵگرتووە یەکێکیان لە ڕووباری هادی و ئەویتریان لە ڕووباری هەڵچوونەوە.
+ هاوڕێی ڕاستگۆ یەکێکە لە داهێنانەکانی سروشت.
- هەموو بەختەوەران لە یەکدەچن، بەڵام خەمخۆران جیاوازن.
+ چەندێ خوێندم زیاتر فێربووم چەندێ فێربووم بیرم چوو چەندێ زیاترم بیرچوو کەمتر فێربووم بۆ بخوێنم؟
- گەر دوانت بینی دەمێك بوو دانیشتبوون بە بێ قسەکردن ئەوە ژن و مێردن.

**لەکەرکوکەوە**

**بۆ هاوڕێم لەوبەر دەریایەوە....**

شێخ صدیق /ڕێگای کوردستان

لە نامەکەی ئەمجارەتا داوای ئەوەتکردووە لە بارەی منالانی کەرکوکەوە هەندێ شتت بۆ بنووسم، برادەر ئەوە کارێکی موسیبەتە ئەگەر وابزانی لە نامەکەی ئەمجارەمدا، شتی دڵخۆشکەرت بۆ بنووسم!؟ هەر چەن ئەمانە بەدەست من نییە ئەوەی بۆت ڕەوانە دەکەم وێنەی تاڵترین منالانی ئەم دونیایە، ئازیزم ئەمجارە ئەگەر پێت کرا ئەم



نامەیەم بگەیەنی بەمنالانی ئەوبەری دەریا، هەر چەند لە گەشتنی ئەم نامەیە دڵنیا نیم بگاتە دەستت چونکە ئەو کەسەی نامەکەت بۆ دێنێ بەخاکی تورکیادا دەگەڕێتەوە پێ دەچێ نامەکە دەستگیر بکەن چونکە بەزمانی کوردی نووسراوە.

برادەر منالانی ئەم شارە بەیانیان کە دەڕۆن بۆ قوتابخانە چاوەڕوانی ئەوەیان لێ ناکرێ بگەڕێنەوە هەمیشە چاوەڕوانی ئەوەیان لێ دەکرێ قوتابخانەکەیان مینرێژکرابێ یان لە ڕێگەی هاتنەوەیان بیان ڕفێنن و بەبیست دەفتەر دۆلار بیان فرۆشنەوە بەدایك و باوکیان، ئازیزم ئەگەر نەکوژرێن نەرفێنرێن ژیانیش هیچ مانایەکی نییە بۆ ئەوان هەمیشە ترسێك لەدڵیاندایە وەك ئێمەی گەورە بیر دەکەنەوە، وەك ئێمە دێن و دەڕۆن ئەو باخچانەش پێشتر هەبوون خالین لە منالان، کۆڵانەکان بێ وازی خەت خەتێن و فتبۆلێنی منالانن، بەئاسمانی شارەوە کۆلارەیەك نابینی، ئاسمانی شار تەنها فڕۆکەکانی ئەمریکایان پێدا دەخولێتەوە....برادەر پۆلەکانی خوێندنیان ساردو سڕو بێ ئاگرە، پەنجەرەکانیان شکاون، باخچەکانیان وشك هەڵگەراون بێگوڵ و گوڵزارن دیواری قوتابخانەکان هەمیشە لافیتەی ڕەشی پێدا هەڵواسراوە و هەواڵی مەرگی باوکی قوتابییەکی تێدایە، ئازیزەکەم لەکۆمپیوتەر و ئینتەرنێت ناخوێنن مۆسیقا و گۆرانی و سەما نازانن تەنها سروودی (ئەی ڕەقیب) دەزانن... دەفتەری وێنەکانیان پڕاوپڕن لە وێنەی تفەنگ و کۆپتەر و فیشەك و سەرباز و ئۆتۆمبیلی سووتاوی دوای تەقینەوە، وێنەی گوڵ و باخچە و ئاژەڵان نازانن، کە دەشگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە لە دایك و باوکیان دەپرسن تیرۆریست ئەگەر بمانبات دەمانکوژێت یان لە ژوورێکی تاریك زیندانیمان دەکەن، ئازیزم منالان هەمیشە پرسیار لە پۆلیس و تیرۆریست وسەربازی ئەمریکا دەکەن....

***

## سەرچاوەکان کە نووسەر سوودی لێوەرگرتوون


١. د. اسماعيل ابراهيم، فن التحرير الصحفي بين النظرية و التطبيق، دارالفجر للنشر و التوزيع، القاهرة ١٩٩٨.

٢. علي الجابري، تقنيات الخبر في الفضائيات العربية، عمون للدراسات و النشر، عمان ٢٠٠٦.

٣. د. محمود ادهم، التحقيق الصحفي، دار الثقافة للطباعة و النشر، ١٩٨١.

٤. د. احمد عبدالمجيد و د. عدنان ابوالسعد، فن المقال الصحفي، كتاب منهجي لطلبة المرحلة الثالثة، كلية اعلام، جامعة بغداد، دار للنشر، ٢٠٠٤.

٥. ………، فن التحقيق الصحفي، عن شبكة الانترنيت (www.a13ez.net

٦. ……، الخبر الصحفي، عن شبكة الانترنيت (www.ahlulbaitonline.com

٧. المقال الصحفي، عن شبكة الانترنيت ((www.faculty.kfupm.edu ))

٨. ليث بدر يوسف، المقال الثحفي في الصحافة العربية، دراسة البناء الفني للمقال في صحف: الاهرام المصرية و النهار اللبنانية و الخليج الاماراتية، اطروحة دكتوراه، كلية الاعلام، جامعة بغداد، ٢٠٠٥.

٩. محمد يوسف نجم، فن المقال، بيروت، دار الثقافة، ١٩٦٦.

١٠. د. اديب خضور، مدخل الى الصحافة النظرية،دمشق، المكتبة الاعلامية، ٢٠٠٠

١١- Types of interviews "www.cl.idaho.gov.......

١٢ – www.cdc.gov

١٣- Elements of News "www.myhome.sunyocc,edu

١٤ The Elements of News " www.test.k12.pa.us

www.weakpedia.com15

-




ئەو سەرچاوانەی کە سوودم لی وەرگرتووە بۆ وەرگێڕانەکە:


١. فەرهەنگی دەریا (عەرەبی – کوردی)، ڕزگار کەریم، بەرگی (١,٢) ساڵی ٢٠٠٥ چاپخانەی سیما – سلێمانی.

٢. فەرهەنگی ڕاگەیاندن (ئینگلیزی - عەرەبی - کوردی) جەمال عەبدول، ساڵی ٢٠٠٦ چاپ و پەخشی سەردەم – سلێمانی.



سوپاس بۆ...

- زۆر سوپاسی هاوڕێی بەڕێزم د.هادی مەحمود دەکەم کە ئەرکی پێداچوونەوەو بەراوردکردنی دەقە عەرەبییەکە و دەقە کوردییەکەی لە ئەستۆ گرت و سەرجەم تێبینی و ڕاستکردنەوەکانی ئەو بوونە مایەی بە بەرهەمهێنانی وەرگێڕانی ئەم کتێبە.

- سوپاسی بێ پایانم بۆ مامۆستا و هاوڕێی بەڕێزم حەبیب کەرکوکی کە ڕێگەی پێدام کتێبەکەی وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی و بەبەردەوامیش هانی داوم و هاوکاری کردووم لەم پرۆژە وەرگێڕانەدا.

- سوپاس و پێزانینم بۆ هاوڕی و هاوسەرم شێخ صدیق کە هاندەرو هاوکاری بەردەوامم بووە بۆ سەرکەوتنی ئەم کتێبە.

- سوپاسی بەردەوامم بۆ دامونی کوڕم کە بە پەنجە ناسکەکانی لە تایپدا هاوکاری کردووم.

**نووسەر لە چەند دێڕێکدا:**

١. ساڵی **١٩٧٥** لە دایکبووە.
٢. قۆناغی سەرەتایی لە ساڵی **١٩٨٧** تەواوکردووە.
٣. قۆناغی ناوەندی لە ساڵی **١٩٩٠** تەواوکردووە.
٤. قۆناغی ئامادەیی لە ساڵی **١٩٩٥** لە کەرکوك تەواوکردووە.
٥. بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە ساڵی **١٩٩٩** وەرگرتووە لە زانکۆی بەغدا کۆلێژی ڕاگەیاندن بەشی ڕۆژنامەنووسی.
٦. بڕوانامەی ماجستەری بەدەستهێناوە لەسەر نامەی (الخطاب السياسي في القنوات الفضائية الكوردية) لە ساڵی ٢٠٠٥ لە زانکۆی بەغدا کۆلێژی ڕاگەیاندن بەشی ڕۆژنامەنوسی.
٧. ئێستا قوتابی خوێندنی باڵایە لە زانکۆی بەغدا کۆلێژی ڕاگەیاندن.
٨. لە ساڵی **١٩٩٦** وە لە بواری ڕۆژنامەنوسی و ڕادیۆو تەلەفزیۆندا کار دەکات وەك پەیامنێر، ڕاسپێراوو دەیان چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنوسی ئەنجامداوە.
٩. بەڕێوەبەری نووسینی ڕۆژنامەی (کرکوك الغد) بووە بە ماوەی ساڵی ٢٠٠٤ – ٢٠٠٥.
١٠. (نووسەری ستوون) بووە لە گۆڤای نێو شەفەق کە دەزگای شەفەق لە کەرکوك دەری دەکات.
١١. زۆربەی نووسینەکانی لە پێگەی (الکاتب العراقی) بڵاودەگاتەوە.
١٢. سەرۆکی بەشی ڕاگەیاندن بووە لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك لە ساڵی ٢٠٠٥ – ٢٠٠٦.
١٣. ئێستا سەرپەرشتیاری کۆلێژی ڕاگەیاندنە لە زانکۆی حورەی هۆڵەندی لقی کەرکوك.
١٤. ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستانە.



**لە ڕووی لێکۆڵینەوە:**

١. (مفهوم الخطابة وسماتة) و (لمحة عن وسائل الاعلام في اقليم كوردستان العراق) دوو لێکۆڵینەوەیە لە ژمارە (٤) و (٦)ی گۆڤاری (عالم الغد) بڵاوکراوەتەوە کە سەرچاوەیەکی ڕاگەیاندنی ڤییێننایە / نەمسایە.سس.
٢. (تغطية القناة العربية الفضائية للانتخابات العراقية) ئامادەیە بۆ بڵاوکردنەوە.
٣. (الازمة السورية اللبنانية في المواقع الاكترونية/ موقع ايلاف أنموذجا) ئامادەیە بۆ بڵاوکردنەوە.

**لە بواری نووسیندا:**

١. کتێبی (قراءة في اوراق خالية) کۆمەڵە چیرۆك ٢٠٠١.
٢. کتێبی (کونراد.. کان هناك) کۆمەڵە چیرۆك ٢٠٠٦.
٣. کتێبی (الخطاب السياسي) في القنوات الفضائية الكوردية ٢٠٠٦.